# پوختەی
# پایەکانی ئیمان

ئامادەکردنی
کـاوان احمد کوردی

نجم الدين فرج احمد
پێیدا چۆتەوەو و
توێژینەوەی فەرمودەکانی کردووە



ناوی کتێب بەکوردی: پوختەی پایەکانی ئیمان
ئامادەکردنی: کاوان احمد کوردی
پێداچونەوە: نجم الدین فرج احمد
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ حمدامین
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٢ك – ٢٠١١ز
تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( 1882 ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تفسیر
بۆبلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحمَدُهُ ونَستعِينُهُ ونَستغفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يَهدِهِ اللهُ فلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلِ فلا هادِيَ لَهُ . وأشهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ .

يا أيُها الذينَ آمَنوا اتقُوا اللهَ حَقَّ تقاتِهِ ولا تمُوتنَّ إلاَّ وأنتمْ مُسلِمونَ

يا أيُها النّاسُ اتقُوا رَبّكُمُ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجالاً كَثيراً ونِساءَ واتقُوا اللهَ الذي تساءَلُونَ بِهِ والارْحامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً

يا أيُها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قولاً سَديداً، يُصلِحْ لكُمْ أعمالَكُمْ ويَغفِرْ لكُمْ ذنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فقَدْ فازَ فوزاً عَظيماً.

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم وشَرَّ الامُورِ مُحدَثاتها، وكُلَّ مُحدَثةٍ بدعَةٌ وكُلَّ بدعَةٍ ضَلالةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ في النّارِ.

## پێشەکی نوسەر

لای هەموان ئاشکرایە، کە لە ئەنجامی تێپەڕ بونی ڕۆژگارو، گۆڕانی بارودۆخی مێژویی و، بڕینی قۆناغ و بەسەرهاتی سەخت و دژوارو، سەرقاڵ بون بە جەنجاڵی دنیاو فەرامۆش کردن و بە هەند نەگرتنی پەیام و بەرنامەی پەروەردگارو، هاتنی شاڵاوی فیکری و سەربازییەوە گۆڕانی، ڕیشەیی بەسەر بیرو هۆشی خەڵکی دا هاتوەو، گەلێك کەس دوچاری گێژاوی گومان و سەرگەردانی تێڕوانین بون و، ئەو هۆکارانە ژیری و ئاوەزی خواردون و خۆرەی نەفامی بە بیروباوەڕیاندا ڕۆشتوەتە خوارەوەو، لەسەرئەنجامی دروست بونی ئەم کەلێنە ترسناکەشەوە، ڕەوشتی ڕەسەن و ڕوانگەی پەسەندو کۆششی مەردانەو هەوڵی شەو ڕۆژانەیان لە دەست داوەو، کەسایەتییان ڕوخاوەو، بە دەیان و سەدان گرفتی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی و فەرهەنگییەوە گلاون و بۆ چارەسەری ئەو مەینەتییانە ئەزمونی دەیان جار شکست خواردویان تاقی کردوەتەوەو، ڕەوتی دەیان ڕێبواری ڕێ ونیان بڕیوە، بەڵام لە شکست بەو لاوە دەستکەوتی تریان نەبوەو، لەسەر گەردانی زیاتر دەروازەی تریان بەدی نەکردوە...

ئنجا لە پێناوی سەرلەنوێ بنیادنانەوەی کەسایەتی مرۆڤی کوردی موسوڵمان و هەڵساندنەوەی قەڵەمڕەوی بزری کوردستاندا، پێویستە بیرو هۆشمان بە ئیمانی پاك و بێگەردی خواناسی قاڵ بکەینەوەو، چەمك و زاراوە فیکرییەکان لەبەر تیشکی ئەو ئیمانەدا ڕاست بکەینەوەو، بەسەر جەم لایەنەکانیڕەوشت وبنیادی کۆمەڵایەتی وڕوانگەی سیاسی و مامەڵەی ئابوریماندا بچینەوەو، لە سۆنگەی پەیامی خواوە دایان بڕێژینەوەو، ژیانی نوێمانی لەسەر هەڵ بچنینەوە...

بۆ ئەم مەبەستەش (پوختەی پایەکانی ئیمان)مان کردوە بە گۆشەنیگای دەست پێ کردن و، هەنگاوییەکەم لەڕێگەی کاروانی پەروەردەییدا، بەو هیوایەی ببێتە مایەی تێگەیشتنەوەی پتەومان لە بیروباوەڕی ئیسلامی، بەڕوانگەی ڕەسەنی قورئان و فەرمودەو بە پێی تیگەیشتنی هەلگرانی ڕاستەقینەی ئەم پەیامە خواییە.

سەرەتا بە (چەمك و واتای ئیمان)دەست پێ دەکەین، پاشان لەگەڵ پایەکانی ئیماندا دەڕۆین... ڕێنمایی و پشتیوانی خوای گەورەمان لەگەڵ بێت.

﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾الانعام/٧١

## چەمك و واتای ئیمان

زانایان دەربارەی واتای ئیمان گوتویانە: (قول باللسان، واعتقاد بالقلب و عمل بالجوارح)واتە: (وتەیە بەزمان و، ئیمانە بە دڵ و، کردەوەیە بە ئەندامەکانی لاشە) بەم پێودانگە:

ئیمان تەنها چەند وشەیەك نییە بەزمان بوترێت، چونکە مرۆڤی دووڕو هەمیشە بانگەشەی بڕواداری خۆی دەکات، بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾البقرة/٨ واتە: لە خەڵكیدا کەسانێك هەن دەڵێن: ئیمانمان هێناوە بە خواورۆژی دوایی و باوەڕداریش نین.

*هەروەها ئیمان تەنها تێڕوانینێکی بێ بەرهەم وڕاو سەرنجێکی ساردو سڕ نییە دەربارەی ڕاستییەکان، چونکە زۆر کەس پەیی بە ڕاستییەکان بردوە و دڵنیا بوە، کە ڕاستن، بەڵام نکوڵی لێکردون و ستەم کاریی و خۆ بەزل زانی بەرچاویان تاریك کردوە، خوای گەورە دەربارەی فیرعەون و شوێن کەوتوانی دەفەرموێت: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ النمل/١٤ واتە: نکوڵییان لە ئایەتەکان کردو ئیمانیان پێ نەهێنان و لە ناخیشەوە دڵنیابون، کە ڕاستن، بەڵام بە هۆی ستەمکاریی و لوت بەرزییەوە ئیمانیان نەهێنا.

* هەروەها ئیمان چەند کردەوەو دروشمێك نییە، کە ئەگەر ئەنجام بدرێت بەس بێت، چونکە هەمو کەسێکی فێڵباز - بۆ ڕوپامایی - دەتوانێت هەمان کردەوە ئەنجام بدات، کە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە ئەنجامی دەدات،

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ النساء/١٤٢ واتە: دو ڕوەکان - بەنیازی خۆیان - خوا دەخەڵەتێنن، بەڵام خوا هەڵوەشێنەرەوەی پیلانی ئەوانە، ئەوانە، کە بۆ نوێژ هەڵدەستن، بەتەمبەڵی هەڵدەستن، ڕوپامایی بۆ خەڵك دەکەن و بەکەمی نەبێت یادی خوا ناکەن.

کەواتە ئیمان: ئەو هەست و نەستە بەرزو پیرۆزەیە، کە لە ناخی مرۆڤدا جێگیر دەبێت و تێکڕایی دەرونی دادەگرێت و، هەمیشە بەزمانی دەری دەبڕێت و تین و تەوژم دەدات بە هەمو ئەندامەکانی و وا لە مرۆڤ دەکات، کە هەر سەرمایەیەکی بەنرخی هەیە لە گیان و ماڵ و کەس و کاری لە پێناویدا بەختیان بکات، چونکە بەلایەوە لە هەمویان بەنرخترە.

## سیمای ئیمانی ڕاستەقینە

یەکەم: دەبێت مرۆڤ تێگەیشتنێکی ژیرانەی دروستی هەبێت، کە بە هۆیەوە پەی بەڕاستییەکانی (ژیان و بونەوەر)ببات، سەرچاوەو تیشکۆی ئەم تێگەیشتنەش، تەنها سروش (وەحی)ی بێ خەوشی خوای گەورەیە، وەك دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ﴾الملك/٢ واتە: پەروەردگار ئەو خوایەیە، کە مردن و ژیانی دروست کردوە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە، ئاخۆ کامتان چاکترین کردەوە ئەنجام دەدات... ئنجا سەرنجدان و ورد بونەوە لە بونەوەرو ژیان، ئیمانی مرۆڤ پتەو ترو دامەزراو تر دەکات. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٠ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ

ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ال عمران/ ١٩٠-١٩١ واتە: لە دروست کرانی ئاسمانەکان و زەوی و گۆڕانی شەو ڕۆژدا بەڵگەو نیشانەی زۆری تێدایە بۆ ئەوانەی ژیرن، ئەوانەی یادی خوا دەکەن بە هەستان و دانیشتن و بە ڕاکشانەوەو بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوەو دەڵێن: ئەی پەروەردگار، ئەم بونەوەرەت بێ هودە دروست نەکردوە، پاك و بێ گەردی بۆ تۆیە، خوایە لە ئاگری دۆزەخ پەنامان بدە.

دووەم: دەبێ ئەو تێگەیشتنە ژیرانەیە بگاتە ڕاددەی دڵنیایی تەواو، بە چەشنێك تەم و مژی هیچ جۆرە گومان و دودڵییەك لە دەرونیدا نەهێڵێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ ﴾ الحجرات/ ١٥ واتە: موسوڵمانان ئەوانەن، کە ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، پاشان هیچ جۆرە گومانێکیان لە دڵدا بۆ دروست نەبوە.

سێ یەم: دەبێت ئەو تێگەیشتنە ژیرانەیەی، کە مرۆڤ قەناعەتی تەواوەتی پێی کردوە، هاوڕێ بێت لەگەڵ مل کەچی و گوێ ڕایەڵی و پابەند بون بە تەعلیماتی خواو پێغەمبەرکەیەوە صلى الله عليه وسلم، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾النساء/ ٦٥ واتە: نەخێر ـ ئەی محمد ـ سوێند بە پەروەردگارت، ئیمانیان نابێت، هەتا تۆ نەکەن بە دادوەر لەو کێشانەدا، کە لە نێوانیاندا ڕودەدات، وە نابێت لە دڵ و دەرونیشیاندا هەست بە هیچ گرێ و گرفتێك

بکەن بە هۆی ئەو بڕیارەوە، کە بۆت داناون و دەبێت بە تەواوی مل کەچ ببن.

چوارەم: دەبێ ئەو تێگەیشتنە دامەزراوەو ئەو مل کەچییە تەواوە هەست و سۆزێکی گەرم و بە تینی لە گەڵدا بێت و، وا لە مرۆڤ بکات بە پێی داخوازی ئیمانەکەی مامەڵە بکات و، بە هەمو ئاکارە ڕەوشتی و کردەوەییەکانەوە پابەند بێت و ئامادەی خۆ بەخت کردن و ماڵ بەخشین و جیهاد کردن بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ الانفال/ ٢-٤ واتە: موسوڵمانان ئەوانەن، ئەگەر باسی خوای گەورە لەلایان کرا دڵیان ڕادەچڵەکێت (هەست و هۆشیان بۆ خواپەرستیی دەڕوات) ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بۆ خوێنرایەوە، ئیمانیان زیاد دەکات و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەش ئەو کەسانەن، کە نوێژ ئەنجام دەدەن و لەو سامانەی پێمان بەخشیون دەبەخشن، ئا ئەوانە بەڕاستی موسوڵمانی ڕاستەقینەن. هەر بۆیە حەسەنی بەسریش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) گوتویەتی: (ليسَ الايمانُ بالتمَنّي ولا بالتحَلّي، ولكِنْ شيءٌ وَقَرَ فِي القَلبِ، وَصدَّقَهُ العَمَلُ)واتە: ئیمان بە ئاوات خوازی و خۆ ڕازاندنەوە نییە، بەڵکو شتێکە لەدڵدا جێگیر دەبێت و کردەوەش دەیسەلمێنێت، کە ڕاستە.

## پایەکانی ئیمان

لە ئیسلامدا ئیمان شەش پایەی هەیە، واتە بە تێکڕایان ئیمان پێك دەهێنن و نکوڵی کردن لە یەکێکیان دەرچونە لە سنوری ئیمان بە یەکجاری، ئنجا لە ڕێگەی فەرمایشتی خوای گەورە و فەرمودەی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بە ڕاستەوخۆ دەتوانین لە هەرکام لەو پایانە حاڵی ببین، پاشان لە ڕێگەی سەرنج دان لە بونەوەرو ژیانەوە بە ناڕاستەوخۆ شارەزاییمان زۆر ترو تێگەیشتنمان قوڵتر ببێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ..﴾ البقرة/ ٢٨٥ واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئیمانی بەو پەیامەی بۆی ڕەوانە کراوە لە پەروەردگاریەوە هێناوە، هەروەها ئیمان دارانیش، هەمویان ئیمانیان هەیە بە خواو بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوەکانی.. هەروەها پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لە وەڵامی جبرائیلدا(علیه السلام) دەربارەی ئیمان فەرموی: ((أن تؤمِنَ باللهِ ومَلائِكَتِهِ وكُتبِهِ ورُسُلِهِ واليَومِ الآخِرِ، وتؤمِنَ بالقَدَرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ )) رواه مسلم[١] واتە: ئیمان بهێنیت بە خوای گەورەو بە فریشتەکانی و بە پەیامەکانی و بە نێرراوەکانی و بە ڕۆژی دوایی، ئیمان بهێنیت بە قەزاو قەدەر بە خۆشی و ناخۆشییەوە.

---

١ موسلیم (٨)ترمزی (٢٧٣٨)، ئەبوداود (٤٧٦٠)، ئیمامی ئەحمەد (١/٥١).

## باوەڕبون بە غەیب

هەریەك لە پایەكانی ئیمان راستییەكی نادیارەو، مرۆڤ بە هەستەوەرەكانی خۆی پەی پێ نابات، بۆیە پێویستە بزانین ئیمان كردن بە نادیار (غەیب)، تا چ ڕادەیەك مەنتیقیانەیەو سنوری ئەو ئیمانەش چەندەیە، خوای گەورە لە وەسفی ئەوكەسانەی خۆیان لە گوناهان دەپارێزن(المتقون) دا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ البقرة/٣ واتە: ئەوانەن ئیمانیان بە نادیار هەیەو نوێژ دەكەن و لەوەی پێمان بەخشیون دەبەخشن.

ئیمانبون بە نادیار ئەو ئاسۆیەیە، كە مرۆڤ دەیگاتێ، ئاستی شایستەی مرۆڤانەی خۆیەتی: كە پێی لە ئاستی نزمی ئاژەڵیانە دەردەچێت، چونكە پەی دەبات بەوەی، كە ئەم بونەوەرە گەورەترو فراوانترە لەو جوغزە تەسك و ڕوبەرە بچوكەی، كە هەستەوەرەكان پەی پێ دەبەن. لە كاتێكدا كە ئاژەڵ نازانێت نادیار چییەو ئەوەی بە هەستەوەرەكانی دەركی پێ نەكات نایزانێت، بێگومانی ئەم ڕوانگەیە بۆ بونەوەر كاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر بیر كردنەوەی مرۆڤ و، هەڵسەنگاندنی ژیانی و پەی بردن بە ڕاستییەكان و ناسینی خودی خۆی و چۆنیەتی مامەڵە كردنی لەگەڵ شتەكانی دەورو بەریدا . چونكە دەزانێت، كە دەسەڵاتێكی بێ سنورو توانایەكی كاربەجێ لە پشت ئەم بونەوەرەوەیەو بە مەبەستێك بەدیهێناوەو ژیانی لە زەویدا فەراهەم هێناوەو ئەو شتانەی، كە تێیدان سەرجەم خزمەت بەو ژیانە دەكەن و، تەواوكەری ڕۆڵی یەكترین و سەردەستەش لە گۆڕەپانی ئەو ژیانەدا مرۆڤەو دەورەكەشی بەو ماوە

کورتەی سەر شانۆی زەوی کۆتایی نایەت، دەبێت ئەوەمان لە یاد نەچێت، کە ئیمان کردن بە ڕاستییە نادیارەکان نابێت ڕەهاو بێ سنور بێت، بەڵکو دەبێت زانیاری لە سەرچاوەی بێگەردی خۆیەوە، کە سروشی پیرۆزی پەروەردگارە دەربارەیان وەربگیرێت، چونکە بواری فیکری مرۆڤ نییە، تاکو بە ئامرازی بیر کردنەوەی خۆی پەییان پێ ببات . چونکە توانای زۆری تێدا بە فیڕۆ دەڕوات و، هیچیش بە هیچ ناکات. لە هەمان کاتیشدا نابێت بە پێی بۆچونی خەڵکی لە هەر بارێکەوە بێت و بۆ هەر بوارێك ئیمان بە نادیار بکەین، چونکە ئەو کاتە لە ڕاستییەکان لاڕێ دەبین و دەکەوینە ئەفسانەو شتی بێ سەرو بەرەوە.

# پایەی یەکەم

## ئیمان هێنان بە خوای گەورە

بەندی یەکەم: دەروازەی ناسینی خوا.

- دەروازەی یەکەم: سەرنجدان لە بونەوەرو ژیان.

- دەروازەی دوەم: سەرنجدان لە توانایی بێ سنوری خوای گەورە.

- دەروازەی سێیەم: سەرنجدان لە زانیاری گشتبینی خوای گەورە.

بەندی دوەم: یەکخوا پەرستی

- یەکەم : جۆری یەکەمی یەکخوا پەرستی پەروەردگارێتی (الربوبية).

- دوەم : جۆری دوەمی یەکخوا پەرستی پەرستراوێتی (الالوهية).

* واتای پەرستن:

* نیازپاکی بۆ خوای گەورە .

* خۆبەری کردن لە تاغوت .

- سێیەم: جۆری سێیەمی یەکخوا پەرستی ناوو سیفەتەکان (الاسماء و الصفات)

- بەدور گرتنی خوای گەورە لە هەمو جۆرە ناتەواویەك .

- ئیمانبون بەو ناوو سیفەتانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتون و بەس .

- نیازبڕین لە پەی بردن بە چۆنیەتی سیفەتەکانی خوای گەورە .

بەندی سێیەم: جۆرەکانی هاوبەش دانان

ـ هاوبەش دانانی گەورە ( الشرك الاكبر ).

ـ هاوبەش دانانی بچوك ( الشرك الاصغر )

* چۆنیەتی خۆپاراستن لە هاوبەش دانان ( شیرك ):

+ هاوبەش دانان لە بیروباوەڕدا ( شرك الاعتقاد ).

+ هاوبەش دانان لە شوێن کەوتندا ( شرك الاتباع ).

* راڤەی هەندێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە.

## ئیمان هێنان بە خوای گەورە

پەی بردن بە زاتی خوای گەورە لە توانای مرۆڤدا نیەو بە هۆی ڕێنمایی پەیامە بەڕێزەکەیەوە نەبێت، مەحاڵە وەك پێویست بتوانین بیناسین، چونکە وەك ئاماژەمان پێکرد ڕاستییەکی نادیارەو بواری فیکری مرۆڤ نییە، تاکو خۆی پێوە خەریك بکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ (102) لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ الأنعام/١٠٢-١٠٣ واتە: ئەوە خوای پەروەردگارتانە، هیچ پەستراوێك نییە، شیاوی پەرستن بێت، بێجگە لەو خوایەی دروستکاری هەمو شتێکە، جا ئێوە بیپەرستن، هەر ئەویشە چاودێرو سەروکارە بەسەر هەمو شتێکدا، بیناییەکان پەی بەو نابەن و نایبینن، بەڵام خوا پەی بە هەمو بیناییەکان دەبات، هەر خۆشی وردەکارو شارەزایە. پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم دەفەرموێت: (تفكَّرُوا في آلاءِ اللهِ ولا تفكَّرُوا في اللهِ)تەبەرانی و بەیهیقی گێڕاویانەتەوەو، شێخی ئەلبانی لە سلسلەی سەحیحەدا دەڵێ: سەحیحە (ژمارە ١٧٨٨)[1]. واتە: بیر لە بەهرەو نیعمەتەکانی خوا بکەنەوەو بیر لە خودی خوا مەکەنەوە.

---

١ـ ئەمەی نوسەری بەڕێز هێناویێتیەوە لای تەبەرانی لە (الاوسط)و لای ئەبو نوعەیمیش هەیە، کە هەردوکیان لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویانەتەوەو شێخی ئەلبانی ڕەحمەتیش لە سلسلەی سەحیحە (٣٩٥/٤) و (صحیح الجامع ٢٩٧٦)دا دەربارەی گوتویەتی: حەسەنە، ڕیوایەتەکەش کە بەیهیقی لە (شعب الایمان)دا لە سەیدنا عومەرەوە هێناویێتیەوە، کە دەفەرموێ (تَفَكَّرُوا في آلاء الله ولا تُفَكَّرُوا في ذات الله) شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی ئەمیشیانی لە (صحیح الجامع ٢٩٧٥ ، ٢٩٧٦) دا هەر بە حەسەن داناوە.

## بەندی یەکەم: دەروازەکانی ناسینی خوا

### دەروازەی یەکەم: سەرنجدان و ورد بەنەوە لە بونەوەرو ژیان:

**١ـ فراوانی بونەوەر:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾البقرة/٢٥٥ واتە: کورسی خوای گەورە بە ئەندازەی ڕوبەری ئاسمانەکان و زەوی فراوانە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْي۟دٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ الذاريات/٤٧ واتە: ئاسمانمان بەهێز بنیاد ناوەو هەر بەرفراوانی دەکەین. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (ما السَّماواتُ السَّبْعُ في الكرسيِّ الا كَحلَقَةٍ مُلقَاةٍ بأرضٍ فلَاةٍ، وَ فضلُ العَرشِ علَى الكُرسِيِّ كفَضلِ تِلْكَ الفَلاةِ علَى تِلكَ الحلَقَةِ)[١] واتە: گەورەیی حەوت ئاسمانەکان لە چاو کورسی خوادا، وەك ئەڵقەیەك وایە لە دەشتێکی چۆڵدا فڕێ درابێت، گەورەیی عەرش بەسەر کورسیدا، وەك گەورەیی ئەو دەشتە چۆڵە وایە لە چاو ئەو ئەڵقەیەدا.. گەردون ناسەکانیش دەڵێن: ئەوەندەی، تا ئێستا پەی پێ براوە بەنوێترین دەزگای (تەلسکۆب)، کە لە دوری چوار هەزارساڵی تیشکییەوە ئەستێرە بەدی دەکات، هەزار ملیۆن کاکەشان هەیەو هەر کاکەشانێکیش لە هەزار ملیۆنەوە، تاکو سی هەزار ملیۆن ئەستێرەی تێدایە، ئەو پەڕی توانای زانستی مرۆڤ هێشتا پەی بەوەندە بردوە، بەڵام

---

١ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە (سلسلة الأحاديث الصحيحة / ٢٢٣/٢ ژمارە ١٠٩)بەڵام لە توێژینەوەیدا دەرکەوت کە سەنەدی گێڕانەوەکەی لە سێ ڕێگاوە لاوازی تێدایە، بەڵام بە کۆی سەنەدەکان (لە ڕێی ئەبو زەڕی غیفاری بە مەرفوعی و ئیبنو مەسعود بە مەوقوف و موجاهید بە مورسەلی) حوکمی حسن لغیرە وەردەگرێت ..

خۆ ئەوە کۆتایی بونەوەر نییە! باشە جیهانێك بە ڕوانگەی کورت بینی مرۆڤ هێندە فراوان بێت دەبێت لە ڕاستیدا دەبێت چەندە فراوان بێت؟ باشە ئەگەر ئەمە فراوانی بونەوەر بێت کە هەرگیز بەبیری مرۆڤ مەزندە ناکرێت، ئەی دەبێت ئەو دەسەڵاتەی دروستی کردوە چەندە گەورەو بە توانا بێت؟!

ب- وردەکاری بونەوەر:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ﴾ النمل/٨٨ واتە: ئەو شاخەی، کە دەی بینن دروستکراوی خوایە کە، هەمو شتێکی بە وردەکاری دروست کردوە. یان دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾القمر/ ٤٩ واتە: ئێمە هەمو شتێکمان بە ئەندازەی دیاریکراو دروست کردوە . بەم پێیە هەمو شتێك مانگ و خۆر، شەو ڕۆژ، باران بارین، ڕۆزی گیانداران، لە دایك بون و مردن، و... هتد، بە ئەندازەی دیاریکرا و دروست کراون دەجوڵێن و ڕودەدەن، هەرگیز لە توانای مرۆڤدا نییە، بەشێکی کەمی ئەم بونەوەرە بە شێوەیەکی (کت و مت) ئامار بکات، گەرچی لە کاتژمێری (الکترون)یش و ردەکارتر دابهێنێت، کە لە چرکەیەکدا (١/٠٠٠ر١٠٠ یەك لە سەد هەزار)تۆمار دەکات، چونکە هەر لە گەردیلەوە، تا کاکەشانە زەبەلاحەکان وردەکارییەکی لە ڕادە بەدەریان تێدایە، بۆ نمونە: (ئەلیکترۆن) لەگەردیلەدا بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوە بە دەوری ناوکدا دەسوڕێتەوە. هەروەها زەوی و مانگ و خۆرو تێکڕای ئەستێرەکان و کاکەشانەکان، هەر هەمویان بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوەو بە خولگەیەکی هێلکەیی (ئیهلیجی)داو بە لاری دەسوڕێنەوە، لەوەش سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە، ڕێژەی دوریی نێوان ئەلیکترۆن و ناوك بە ئەندازەی ڕێژەی دوریی نێوان خۆرو ئەستێرە گەڕۆکەکانە.

**ج- گۆڕانكاری لە بونەوەرو ژیاندا:**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ وَلَوْ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْـِۧىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا ﴾ الفرقـان/٤٥-٤٩ واتـە: ئایـا نابینیـت چۆن پەروەردگارت سێبەر ـ لـە بەرەبەیاندا ـ درێـژ دەكاتـەوە، ئەگـەر خـوا بیویستایە جـێگیری دەكـردو بەهـەڵهاتنی خۆرەكـە نەدەسـرایەوە، پاشـان خۆرمان كردەوە بە هۆیەك بۆ دروست بونی سێبەر، پاشـان بـە هێواشـی دەیكێشینەوە بۆلای خۆمان، هەر ئەو خوایەیە شەوی كردوە بـە پۆشـاك و خەوی كردوە بە مایەی حەوانەوەو ڕۆژی كردوە بە كاتی بلاوە لـێ كـردن بـۆ كـارو كاسـبی، هـەر ئـەوە لـە پـێش هـاتنی ڕەحمەتەكەیـەوە ـ وەك موژدەیـەك ـ بـا هەڵدەكات، كـە بارانـە، وە لـە ئاسمانـەوە ئـاوێكی خـاوێن كـەرەوەمان بارانـدوە، بـۆ ئـەوەی خـاكێكی وشـكی مـردوی پـێ زینـدو بكەینـەوەو ئـەو ئـاژەڵ و خەڵكـە زۆرە بـەو بارانـە تێـر ئـاو بكـەین كـە دروسـتمان كـردون. گۆڕانكـاری لـە ژیـان و بونـەوەردا بەردەوامـە، لەسـەر هـەمو ئاسـتەكانەوە. ڕۆژانـە بگـرە هـەمو كاتـژمێرو چـركەو خولـەكێك ڕوداوێك، یـان زیـاتر ڕو دەدات، بـە نمونـە: لـەدایك بـون، مـردن، دەسـەڵات پەیـدا كـردن، ژێـر دەسـت بـون، هەژاركـەوتن، دەوڵەمەنـد بـون، نـەخۆش كـەوتن، چـاك بونـەوەو... هتـد، ئەمانـە وەك گیانـدار... ئینجـا وەك سـەر زەوی: ڕۆژ هەڵاتن، شەوداهاتن، باهـەڵكردن بـاران بـارین، خـۆر گیـران و... هتد، بەم چەشنە گۆڕانكاری بێ وچان بەڕێوەیە... دیارە زۆرو كـەم نـاخی

مرۆڤ دەهەژێنن و ڕای دەچڵەکێنن و پەلکیشی دەکەن بۆ ئەوەی بپرسێت: باشە بۆ ژیان و بونەوەر ئەم هەمو گۆڕانەی تێدا ڕودەدات؟ کێ بزوێنـەری ئەم گۆڕانکاریانەیە ؟ چۆن ئاوا بە هاوسەنگی بەڕێوە دەچن؟

**د ـ دیاردەی ژیان و مردن:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الزمر/٤٢ واتە: خوا گیانەکان کاتی مردنیان دەکێشێت و گیانی ئەوانەش، کە لە خەودان دەکێشێت، ئنجا گیانی ئەوانە گل دەداتەوە، کە مردن دەدات بەسەریانداو گیانی ئەوانە، کە هێشتا سەرەی مردنیان نەهاتوە تا مۆڵەتێکی دیاریکراو دەهێڵێتەوە، بە ڕاستی ئەم ژیان و مردنە، بەڵگەی زۆری تێدایە بۆ ئەوانەی بیر دەکەنەوە. ئەگەر مرۆڤ خاوەنی هەستێکی ناسك و دڵێکی زیندو بێت، بێگومان دیاردەی ژیان و مردن، کار لە قوڵایی دەرونی دەکات... باشە، چۆن لە ماددەیەکی بێگیان و مردو ژیانێکی پڕ جۆش و خرۆش و گەشەو جوڵە فەراهەم دێت؟ یەك خانەی زیندو بەو سادەیییەی خۆی دەبێت بە هەمو فەرمانەکانی ژیان هەستێت لە: خواردن و هەناسەدان و گەشەکردن و زۆر بون و جوڵەو خۆ ڕاهێنان لەگەڵ دەوروبەردا!! کەس هەیە لە خۆی ڕاببینێت، کە تاکە مێشولەیەك دروست بکات ؟ وڵاتی ڕوسیا داوای لە (ئۆبارین)کرد، کە سەرۆکی پەیمانگای کیمیاگەری سۆڤیەتی جاران بو، کە لەوە بکۆڵێتەوە، کە تا چ ڕادەیەك دەتوانرێت لە ڕێگەی کارلێکی کیمیاییەوە ژیان بەدی بهێنرێت، بەڵام پاش سەرقاڵییەکی درێژخایەن، کە بیست ساڵی خایاند، لە (١٩٦٢)دا ڕایگەیاند، کە کۆتایی بە

لێکۆڵینەوەکەی هێناوەو دەرئەنجامەکەی لە ڕێگەی هەمو کەناڵە جیهانییەکانەوە بڵاوکرایەوە، کە: لە ڕاستیدا زانستی کیمیاگەری دەستەوستانەو لە توانایدا نییە لە تاقیگەدا ژیان بەدی بهێنێت، زانست تەنها لەگەڵ ماددەی بەرهەستدا دەگاتە ئەنجام . ئەمە نهێنی ژیان بو... ئەی مردن؟

هەر مرۆڤێك دەیان و سەدان خولیاو ئاوات لەزیهنی دا گەڵاڵە دەکات و، بە هیوایە بەدی یان بهێنێت، کە دەمرێت بۆ کوێ یان دەبات؟ هەروا بە ئاسانی ڕۆژگاری ژیانی ئاوا دەبن و خۆڵ چاوی پڕ دەکات؟! بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، یاخود پرسی پێ بکرێت پەردەی شانۆی ژیانی دادەرێتەوە؟! کێ یە ئەو گیانە دەکێشێت و بە چ سەرئەنجام و چارەنوسێکی دەگەیەنێت؟ ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾الملك/٢ واتە: ئەو خوایەی مردن و ژیانی دروست کردوە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە، ئاخۆ کامتان باشترین کردەوە ئەنجام دەدەن؟.

## دەروازەی دووەم: سەرنج دان لە توانایی بێ سنوری خوا:

مرۆڤ لە دو حاڵەتدا هەست بە لاوازی و دەستەو ستانی خۆی دەکات:

١ـ کاتی منداڵی: کە توانای جێگۆڕکێ و ڕاوەستان و قسەکردن و شت هەلگرتن و ڕۆشتنی نییە، ئنجا وردە وردە دەتوانیت بە هەندێکیان هەستێت، بەڵام دڵی ئاو ناخواتەوەو هەوڵی زیاتر دەدات و ناتوانێت بە خواستی خۆی ئەوی مەبەستیەتی جێبەجێی بکات، پاشان دەتوانێت هەندێك لەو کارانەی پێش ساڵێك لەمەوبەر نەیتوانیوە ئەمساڵ ئەنجامیان بدات، بەڵام لەگەڵ گەورەبونی خۆیدا ڕوبەری خواستەکانی

فـراوان دەبێـت، لـە هـەمان کاتـدا جـار لەگـەڵ جـار لاوازی و دەستەوسـانی خۆی بۆ ئەو دیاردانەی کە توانای لە ڕادده بەدەریان دەوێت لە ژیان دا، لە بونەوەردا لە خودی مرۆڤ دا.

**٢ـ حاڵەتی تەنگاوی:** زۆر جار مرۆڤ بە هۆی توانای لاشەییەوە، یان بە هۆی دەوڵەمەندییەوە، یان کەسدارییەوە، یان دەسەڵاتەوە یاخی دەبێت و بیر لە توانایەکی لە خۆی باڵاتر ناکاتەوە، بەڵام کاتێك دەستی لەو توانایانە دەبڕێت و هیچ دەرویەکی بۆ نامێنێتەوە، نە خۆی دەتوانێت لەو تەنگاوییە خۆی ڕزگار بکاو، نە سامانەکەی و نە کەس و کاری و بە دەسەڵات و پلەو پایەکەی دەتوانن ڕزگاری بکەن، ئنجا بە جەختی فیترەتی ڕو دەکاتە خوای گەورەو دان بەو ڕاستییەدا دەنێت، کە هەر خوا تاکە دەسەڵاتی بێ وێنەیەو هەمو دروستکراوەکانی ئاتاجی ئەون. خوای مەزن دەفەرموێت:﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾یونس/٢٢ واتە: هەر خوایە، کە لە وشکانی و دەریادا بە ڕێتان دەخات و توانای ڕۆیشتنتان پێدەدات، هەتا کاتێك دەچنە کەشتییەوەو بە شنەبایەکی خۆش بە ڕێی دەکەین و پێی دڵخۆش دەبن، ئنجا ڕەشەباو بۆرانێك لێیان هەڵدەکات و شەپۆل لە هەمو لایەکەوە گەمارۆیان دەدات و دڵنیان، کە ئیتر نوقمیان دەکات و دەخنکێن، بە دڵسۆزی و نیازێکی پاکەوە دەپاڕێنەوە لە خواو ملی بۆ کەچ دەکەن، دەڵێن: ئەگەر لەم مەرگەساتە ڕزگارمان بکەیت، دەچینە ریزی ئەو کەسانەوە، کە سوپاس گوزارن.

## دەروازەی سێیەم: سەرنج دان لە زانیاری گشت بینی خوا:

کاتێك مرۆڤ لەخۆیەوە دەڕوانێت و دەبینێت زانیارییەکانی کورت بین و سنوردارن و پەی نابەن بە زانینی ڕوداوێکی ساڵێکی تر، بگرە هەفتەیەکی ترو ڕۆژێکی ترو ساتێکی تر، نازانێت ئایا چرکەیەکی تر چی بەسەردێت و توشی چی دەبێت ؟ زۆر جار پەنا بۆ هۆکاری نامەنتیقیانە دەبات، تاکو پەی بە شتێك لە چارەنوسی نادیاری ببات بۆ ئەوەی دڵی ئاو بخواتەوە، وەك جادو سیحرو ئەستێرەگەری و فالگرتنەوەو... هتد، بەلام بێ سەرئەنجامە.

جا ئەم هەستە، مرۆڤ جڵەوگیر دەکات بۆ ئەوەی لە چارەنوسی ئەو هەمو دروستکراوانە ڕامێنێت و بیر بکاتەوە، کە هەر لە دەنکە تۆوێکەوە، هەتا زەبەلاحترین کاکەشان پێویستی بە چاودێری وردو ئاگاداری سەر لەبەری (ڕابردو، ئێستا، داهاتو) یان هەیە، ئەوەش هەر لە زانیاری گشت بینی خوا دەوەشێتەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٥٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾الأنعام/ ٥٩-٦٠ واتە: کلیلەکانی غەیب زانی لای خوای گەورەیە، هیچ کەس نایزانێت خۆی نەبێت، هەرچی لە وشکانی و دەریادا بێت ئاگای لێیەتی، هەر گەڵایەك بوەرێت دەزانێت و هەر دەنکە تۆوێك لە تاریکاییەکانی زەویدا بێت، یان تەڕاییەك، یان وشکاییەك لە نوسراوی ڕونکراوەی خوادا هەیە، هەر ئەویشە، کە بە شەو گیانتان دەکێشێت و

دەزانێت بە ڕۆژ خەریکی چین، ئینجا هەر لە ڕۆژدا زیندوتان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی مۆڵەتێك، کە بۆتان دیاری کراوە بەسەر بچێت، ئینجا گەڕانەوەتان بۆ لای خۆیەتی، پاشان هەواڵتان پێ دەدات، کە چ کارێکتان کردوە.

## بەندی دووەم: یەکخوا پەرستی

ئیمان گرنگییەکی حەتمی و چارەنوسیانەی هەیە بۆ مرۆڤ، چونکە ئاڕاستەی مرۆڤ دیاری دەکات و تەفسیری ژیانی دەکات و سەرئەنجام و داهاتوی بڕیار دەدات، بەختەوەری، یان خاکە سارییە.. بەهەشتی نەبڕاوە، یان دۆزەخی هەمیشەییە، کەوابو نابێت کەم تەرخەمی تێدا بکرێت و سەرپێیانە تەماشا بکرێت واتە: بون و نەبونی وەکو یەك دابنرێت، بەڵکو پێویستە جەختی لەسەر بکرێت و گرنگی تەواوی پێ بدرێت و چۆنیەتیو پێویستی ئەو ئیمانە بزانرێت.

## پێویستە بە ئیمانی یەکخوا پەرستی خوا بناسین

خەڵك لە کۆن و نوێدا خوایان ناسیوەو ئیمانیان بە بونی هەبوە مەگەر بە دەگمەن ـ چونکە ئیمان داخوازییەکی (فیتری) یە، بۆیە ئیسلام جەخت لەسەر بونی خوا ناکات، بەڵکو گرنگی بە چۆنیەتی ناسینی خوای گەورە دەدات، چونکە خەڵکی بە زۆری لەم لایەنەوە گومڕا دەبن و سەریان لێ دەشێوێت..

پێش هاتنی ئیسلام عەرەبەکان ئیمانیان بە خوا هەبو، بەڵام لە هەمان کاتدا شتی تریان دەپەرست و تێکڕا سەر گەردان ببون، بێجگە لە کەسانێکی کەم، کە لەسەر ڕێبازی (حنیفی) مابونەوە وەك: زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل.

بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە (أبو رجاء العطاردي) یەوە دەگێڕێتەوە، کە دەیگوت: ئێمە بەردمان دەپەرست، ئەگەر بەردێکی ترمان بدۆزیایەتەوە لەم جوانتر بوایە، ئەممان فڕێ دەداو جوانەکەمان دەپەرست، ئەگەر بەردمان دەست نەکەوتایە، هەندێك خۆڵمان گرد دەکردەوەو بزنێکمان دەهێنا، شیرەکەیمان بەسەردا دەدۆشی بۆ ئەوەی تەڕ ببێ، ئینجا دەمان شێلاو تەوافمان بە دەوریدا دەکرد.

هەیانبو بتیان لە خورما دروست دەکردو دەیان برد بۆ سەفەر، کە خواردنیان تەواو دەبو، برسیەتی زۆری بۆ دەهێنان خوا خورماییەکەیان دەخوارد!!

لە وڵاتی فارس ئاگریان دەپەرست.. لە هیندستان بتپەرستی گەیشتبوە لوتکە، لە سەدەی شەشەمی زاینیدا ژمارەی پەرستراوەکانیان بە (٣٣٠) ملیۆن مەزندە کراوە. ئایینە ئاسمانییەکانیش شێوێنرابون و بە خاوێنی نەمابونەوە، چونکە هاوبەش دانانیان تێکەڵ ببو، بۆ نمونە: جولەکەکان دەیان وت: (عوزێر) کوڕی خوایەو، گاورەکان دەیان وت: (مەسیح: سەیدنا عیسا) کوڕی خوایەو عەرەبەکان، کە لەسەر ئاینی (حەنیفیە) بون سەرەڕای بت پەرستییەکەیان دەیان وت: (فریشتەکان) کچی خوان و، ئەو کەعبەیەی سەیدنا ئیبراهیمی بت شکێن دروستی کردبو (٣٦٠) بتی تێدا بو.

بەم شێوەیە بیروباوەڕی یەکخواپەرستی بە دەگمەن نەبێت لە ناو مرۆڤایەتیدا نەمابو، ئنجا خوای گەورە دوایین پەیامی یەکخواپەرستی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی خەڵکی لەو شەوە زەنگە قوتار ببن، لەبەر ئەوە ئیسلام ئەوپەڕی جەخت لەسەر چەسپاندنی (یەکخواپەرستی) دەکاتەوە و خەڵکی بانگ دەکات بۆی و بە هەمو شێوازێك ڕونی دەکاتەوە.

## واتای یەکخوا پەرستی و بەشەکانی

یەکخواپەرستی: بریتییە لە بەتەنها ناسینی خوای گەورە، لە پەروەردگاریەتی و پەرستراویەێتی و ناوو سیفەتەکانیدا.
بەم پێو دانگە یەکخواپەرستی دەکرێت بە سێ بەشەوە:-

یەکەم: یەکخواپەرستی پەروەردگارێتی (الربوبیة).
دوەم: یەکخواپەرستی پەرستراوێتی (الالوهیة).
سێیەم: یەکخواپەرستی ناوسیفاتەکان (الاسماء و الصفات).

## یەکخوا پەرستی پەروەردگارێتی (توحید الربوبیە)

بریتییە لە بەتەنها ناسینی خوای گەورە لە کارو فرمانەکانیدا، وەك: دروست کردن و خاوەنیەتی و مشور خواردن و ژیاندن و مراندن و ڕۆزیدان و سود گەیاندن و زیان گەیاندن و... هتد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾الجاثیة/٣٦ واتە: سوپاس وستایش بۆ خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی، پەروەردگاری هەمو جیهان. یاخود دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴾یونس/٣١-٣٢ واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بە بێ ئیمانان بڵێ: کێ لە ئاسمان وزەوییەوە ڕۆزیتان بۆ دابین دەکات؟ کێ بیستن و بینینەکانی بەدەستەو خاوەنیانە ؟ کێ لە تەنی

مردو زیندو بەدی دێنێت و لە زیندوش مردوی بێ گیان دەخاتەوە ؟ ئەی کێ مشوری کارو فرمان دەخوات؟ ئەوا دەڵێن: خوا، تۆش بڵێ: ئەی بۆ لە خوا ناترسن؟ ئەوە خوای گەورە، پەروەردگاری ڕاستەقینەتانە، لە دوای ڕاست و ڕەوایی چیتر هەیە، بێجگە لە ناڕەوایی؟ ئیتر چۆن ئاوا لاڕێ دەبن؟ پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لە نزای (سید الإستغفار) دا دەفەرموێت: (اللهُمَّ انتَ رَبّي، لا الهَ الا انتَ، خَلَقْتَني و أنا عَبْدُكَ)رواه البخاری[١] واتە: خوایە تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت، جگە لە تۆ، دروستت کردوم ومن بەندەی تۆم.

**پەیوەندی یەکخوا پەرستی پەروەردگاریەتی بە دو بەشەکەی ترەوە:**

وشەی (رَبُّ) لە زمانی عەرەبیدا واتایەکی بنچینەیی هەیە، کە (پەروەردە) یە بەڵام چەند واتایەکی تریش هەڵدەگرێت و لە قورئانیشدا بەو واتایانە هاتوە، وەك: چاودێرو سەروکار، گەورەو پشتیوان، دەسەڵاتداری فسەڕەوا، پادشاو خاوەن، بەم پێیە (یەکخواپەرستی پەروەردگارێتی) دەبێتە بنچینە بۆ هەردو بەشەکەی تر، چونکە:

أ) ئەگەر خوایەك دروستکەرو مشور خۆرو خاوەن و دەسەڵاتدارو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرو گەورەو پشتیوان بێت، هەر ئەویش شایستەی پەرستن و گوێڕایەڵی کردن و مل کەچییە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا

---

١ ـ تەواوی دوعاکە ئەمەیە: (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ)بوخاري (٥٩٤٧)

﴿... لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾البقرة/٢١-٢٢ واتە: ئەی خەڵکینە ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن، کە دروستی کردون، ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردوە، تا تەقوای بکەن و لێی بترسن، ئەو خوایەی زەوی بۆ کردون بە ڕایەخ و ئاسمانی کردوەتە بونیادێکی دامەزراو لە ئاسمانەوە ئاوی باراندوەو بەو ئاوە بەرو بومی ڕواندوەو کردویەتی بە بژێوی و ڕۆزی ئێوە، کەواتە هاوتا بۆ خوا دامەنێن و خۆشتان دەزانن هیچ هاوتایەکی نییە.

ب) ئەگەر خوایەك هەرچی فرمان و ئاڵوگۆڕو مشور خواردنی ئەم بونەوەرەی بەدەست بێت و، هەر خۆی خاوەنی بێت و دروستکەری بێت، حەتمەن دەبێت هەمو سیفەتێکی تەواوی هەبێت و دور بێت لە هەمو لەکەو کەم و کوڕییەك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾الصافات/١٨٠ واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارت لە هەمو کەم و کوڕییەك، پەروەردگاری شکۆمەندی، لەوەی بە نادروست و ناڕەوا وەسفی دەکەن... یان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا﴾الإسراء/٣٠ واتە: پەروەردگارتە، کە ڕۆزی والا دەکات و دەی بەخشێت بەو کەسەی خۆی دەیەوێت و، خۆشی ئەندازە گیری دەکات، هەر ئەویش شارەزاو بینایە بە بەندەکانی خۆی.. بێگومان بە تەنها ناسینی خوای گەورە لە پەروەردگاریەتی دا بە تەنها دادی کەس نادات و سودی نابێت مادەم نەبێتە بنچینەو بناغە بۆ دو بەشەکەی تری یەکخواپەرستی، چونکە زۆر کەس وتویانە: خوا دروست کەرەو ڕۆزی دەرە، بەڵام هاوبەشیان بۆ داناوە لە پەرستندا، یاخود سیفەتی ناتەواوی یان داوەتە پاڵی، خوای گەورەش دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿و وَمَا يُؤْمِنُ

أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ ﴾یوسف/١٠٦ واتە: زۆربەیان ئیمان بە خوا ناهێنن بە جۆرێك نەبێت، كە هاوبەشی بۆ دادەنێن.

موجاهید ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: ئیمان هێنانیان بە خوا ئەوەیە دەڵێن: خوا دروستی كردوین و ڕۆزیمان دەدات و دەمان مرێنێت، ئەمە ئیمانەكەیانە لەگەڵ ئەوەشدا، غەیری خوا دەكەنە هاوبەشی لە پەرستندا.

## یەكخوا پەرستی پەرستراوێتی (توحید الألوهیة )

بریتییە لە بە تەنها ناسینی خوای گەورە لە پەرستندا بە هەموو شێوەكانییەوە، وەك: نوێژو ڕۆژو زەكاتدان و حەج كردن و قوربانی دان و پاڕانەوەو تكاكردن و ملكەچی و شوێن كەوتن و.. هتد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ الحج/٧٧ واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ڕكوع بەرن و كڕنوش ببەن و پەروەردگارتان بپەرستن و كاری چاكە بكەن، بەڵكو سەرفراز بن. هەروەها دەربارەی هەمەلایەنی پەرستن بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾الأنعام/١٦٢-١٦٣ واتە: بڵێ: من نوێژو قوربانی كردن و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، هیچ هاوبەشی نییە، بەو شێوە فەرمانم پێ كراوە، كە بیپەرستم و منیش یەكەم كەسم، كە ملكەچ دەبم و چاوم لێ دەكرێت. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (حَقُّ

اللهِ على العبادِ أنْ يَعْبُدُوهُ، ولا يُشرِكُوا بهِ شَيئاً)متفق عليه[١] واتە: مافی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی .

**پەیوەندی یەکخوا پەرستی پەرستراوێتی بە دو بەشەکەی ترەوە :**

وشەی (ألـه) لـە زمـانی عەرەبیـدا واتایـەکی سـەرەکی هەیـە، کـە (پەرسـتراو)ە، چـونکە (الـة) بـە واتـای (مَـألوە) ە واتـە: پەرسـتراو، بـەڵام بەچـەند واتایـەکی تـریش هـاتوە، کـە بـە تێکرایـان واتـای پەرسـتراویەتی (ألوهية) مان بۆ ڕون دەبێتەوە، لەو واتایانەش:

ـ نیـاز مەنـد: چـونکە جێگـەی نیـازی بەندەکەیـەتی و لـە هـەمو تەنگانەیەکی دەرونی و ماددی دەربازی دەکات و هێورو دڵنیای دەکاتەوە .

ـ پشـتیوان و داڵـدەدەر: چـونکە بەندەکـەی لـە چـنگی مەترسـییەکان ڕزگار دەکات و داڵدەی دەدات و پشتیوانیەتی.

ـ ڕوتێکراو: چونکە بەندەکەی زۆر سڵی لێ دەکاتەوەو خۆشی دەوێـت و تامەزرۆیەتی و هەمیشە دڵی لە لایەتی.

بەم پێودانگە پەرستراو هەر ئەو خوایەیە، کە جێگەی نیازو مەبەسـتی بەندەکەیـەتی و لـە کـاتی تەنگانـەو سـەغڵەتیدا هـەر ئـەو فریادڕەسـی ڕاسـتەقینەیەو پشـتیوانی لـێ دەکـات و داڵـدەی دەدات و زاتێکـی وایـە، کـە بەنـدەکەی پڕ بەدڵ سڵی لێ دەکاتەوەو شەرمی لێ دەکات و خۆشی دەوێـت و تامەزرۆیەتی، ئنجا ئەم جۆرە پەرسـتراویەتییە هـەردو بەشـەکەی تـری یەکخواپەرستی دەگرێتەوە چونکە:

أ) کاتێك بەندە بەو چەشنە خـوای خـۆی دەپەرسـتێت، کـە دڵنیـا بێـت

---

١ـ متفق علیە... ئەمە لەفزی بوخاریە (٥٦٢٢).

دروستکەرو خاوەن و مشور خۆرو ڕۆزی دەرو ژیێنەرو مرێنەریەتی، ئەگەر نە چۆن ئاوا خۆی تەسلیمی دەکات و ملکەچی دەبێت.

ب) هەروەها دەبێت دڵنیا بێت کە خاوەنی هەمو ناوو سیفەتێکی بەرزو تەواوەو دورە لە هەمو لەکەو ناتەواوییەك، چونکە بەندایەتی بۆ کەسێك ناکرێت، کە ناتەواو بێت، بەڵام هیچ کام لە دو جۆرەکەی تری یەکخواپەرستی ئەم بەشەیان ناگرێتەوە چونکە: زۆر کەس دان دەنێت بەوەدا، کە خوا دروستکاریەتی و ڕۆزی دەریەتی و ژیێنەرو مرێنەریەتی، بەڵام غەیری خوا دەپەرستێت، یاخود زۆر کەس ئیمانی وایە، کە پەروەردگاری ئەم بونەوەرو ژیانە خاوەنی هەمو سیفەتێکی تەواوە، بەڵام بێجگە لە خواش دەپەرستێت.

## واتای پەرستن:

وشەی پەرستن (العبادة) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای: (پابەند بون و ملکەچ کردن و گوێ ڕایەڵی کردن)دێت . ئیبن تەیمیەش ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە پێناسەیدا دەڵێ: (العبادة: هي اسمٌ جامِعٌ لِكُلِّ مَا يُحِبُّهُ اللهُ ويَرضَاهُ من الأقوالِ و الأعمالِ الباطِنَةِ و الظاهِرَة) واتە: پەرستن: ناوێکی گشتگیرە بۆ هەمو ئەوانەی خوا خۆشی دەوێن و پێیان ڕازییە لە وتەو کردەوە پەنهان و ئاشکراکان).. هەروەها دەربارەی ناوەڕۆکی پەرستنیش دەڵێ: (العبادة المأمورُ بها تتضَمَّنُ معنى الذّلّ ومعنى الحبّ، فهي تتضَمَّنُ غاية الذل لله تعالى، بغاية المحَبَّةِ له)واتە: ئەو پەرستنەی، کە فەرمانی پێکراوە واتای ملکەچی و واتای خۆشەویستی دەگرێتەوە، واتە: ئەو پەڕی ملکەچی بۆ خوای گەورەو ئەوپەری خۆشویستنی دەگرێتەوە)، بێگومان

مەبەست لە دروستکراوانی مرۆڤ تەنها پەرستنە بە واتا گشتییەکەی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾الذاريات/٥٦ واتە: جنۆکەو مرۆڤم بۆ هیچ مەبەست و ئەنجامێك دروست نەکردوە تەنها پەرستن نەبێت.. هەروەها مەبەست لە ڕەوانە کرانی پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت تەنها بۆ رون کردنەوەو گەیاندنی پەیامی پەرستنی خوا بوە بە تاك و تەنهایی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴾الأنبياء/٢٥ واتە: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم لە پێش تۆوە هەر پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، نیگامان بۆ کردوە تاکو بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، کە هیچ پەرستراوێك نییە شیاوی پەرستن بێت بێجگە لە من، دە بمپەرستن..

هەر کارو کردەوەیەك ئەم مەرجانەی تێدا بێت، پەرستنەو پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت:

١ـ ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات موسوڵمانبێت.

٢ـ مەبەستی لە کردنی ئەو کارە تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

٣ـ کارەکەی لەگەڵ پەیامی خوادا بگونجێت و پێچەوانەی(سُنة) نەبێت.

٤ـ ڕەچاوی پێشینە (أولوية)ی تێدا بکات. کە لە پێشە یان لە پێشتر.

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴾النساء/ ١٢٤ واتە: هەرکەس کارێکی چاکە بکات، نێر بێت، یاخود مێ، هەر موسوڵمانبێت، ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو ستەمیان بە ئەندازەی تاڵە

داوێـــك لـــێ ناكرێـــت. یـــاخود دەفـــەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ﴾الأنعام/١٦٢-١٦٣ واتە: بڵـێ: مـن نوێـژو قوربـانی و ژیـان و مـردنم بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانیانـە، هـیچ هاوبەشـی نییـە.. پێغەمبـەریش صلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێت: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمْرُنَا فَهوَ رَدٌ)رواه مسلم[1] واتە: هەرکەس کارێك بکات و ئەم دینەمان نەیگرێتەوە، لێ ی وەرناگیرێت. یـاخود دەفـەرموێت: (قـال تعالى: وَمَا تَقَرَّبَ إليَّ عَبدِي بشَئٍ أحَبَّ إليَّ مِمَّا افتَرَضتهُ عَلَيهِ)[2] واتە: خوای گـەورە دەفـەرموێت: بەندەکـەم بـەهیچ شـتێك لـێم نزیـك نابێتـەوە خۆشەویسـتربێت لـەلام لـەوەی کـە فـەرزم کـردوە لـە سـەری. هـەروەها دەفەرموێت: (إنَّ اللهَ كَتَبَ الإحسانَ عَلى كُلِّ شَئٍ) رواه مسـلم[3] واتـە: خـوا چاکەی لەسەر هەمو شتێك نوسیوە .

### ( لا اله الا الله ) دروشمی یەکخوا پەرستییە :

لا اله الا الله واتە: هیچ پەرستراوێك نییەشایستەی پەرستن بێت، بێجگە لە خوا... بێگومان ئەم وشە پیرۆزە هەرسێ بەشەکەی یەکخواپەرستی دەگرێتەوە بۆیە پێ ی دەوترێت: وشەی یەکخواپەرستی

---

١ ــ ئەمـە ریوایـەتی موسـلیمە، بـەڵام ریوایـەتی متفـق علیـە بوخـاری و موسـلیمیش هەیـە، کـە دەفەرموێ: (مَنْ أحْدَثَ فِي أمْرِنَا هَذَا مَا لَيسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ )بوخاری (٢٦٩٧)موسلیم (١٧١٨).

٢ ـ نوسەری بەڕێز نوسیویێتی (حديث قدسي ، رواه البخاري)ئەوەش هەمو فەرمودەکەیە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ قَالَ مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الذي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنْ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ) بوخاری / کتاب الرقائق (٦١٣٧).

٣ـ موسلیم (١٩٥٥)، ئەبوداود (٢٨١٤) ، ترمزي (١٤٠٩) ،نسائي (٤٤١٠)..

(كلمة التوحيد)و یەکەم پایەو گەورەترین پایەی ئیسلامە، خوای گەورە دەربارەی بەرزی و گەورەیی ئەم دروشمە دەفەرموێت:﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ال عمران/ ۱۸ واتە: خوا شاهیدی داوە کە هیچ پەرستراوێك نییە خۆی نەبێت، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکان شاهیدییان داوە، کە لە هەمو فرمانێکیدا دادگەریی ئەنجام دەدات، هیچ پەرستراوێك نییە، بێجگە لەو خوایەی شکۆمەندو کاربەجێ یە.. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (قالَ موسى: يا رَبِّ عَلِّمني شَيئًا أذكُرُكَ و أدعُوكَ بهِ، قالَ: يا موسى قُل: لا اله الا الله، قالَ: كُلُّ عِبادِكَ يَقولونَ هذا، قالَ: يا موسى، لو السَّمواتُ السَّبعُ و عامِرُ هُنَّ غَيري، والأرَضينَ السَّبعِ في كِفَةٍ، و لا اله الا الله في كِفَةٍ، مَالَتْ بِهِنَّ لا اله الا الله)[1] واتە: موسا سەلامی خوای لێ بێت فەرموی: ئەی پەروەردگار شتێکم فێر بکە یادت بکەم و پێی بپاڕێمەوە، فەرموی: ئەی موسا، بڵێ: (لا اله الا الله)، فەرموی: هەمو بەندەکانت وا دەڵێن، فەرموی: ئەی موسا، ئەگەر حەوت ئاسمانەکان و ئەوەی بێجگە لە من ئاوەدانی کردونەوە و ، حەوت چینی زەوی لە تای تەرازویەکدا بن و (لا اله الا الله)ش لە تایەکیدا بێت، (لا اله الا الله)کە پارسەنگیان دەداتەوە .

یەکەم دەروازەیەك، کە مرۆڤ لێوەی بێتە ناو ئیسلامەوە، شایەتیدانە بە وتنی لا اله الا الله، وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ قالَ: لا اله الا الله وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللهِ حُرِّمَ دَمُهُ وَمَالُهُ)مسلم[2]

---

۱ ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە کە (رواه ابن حبان و الحاكم وصححه)ئیبنوکەپیریش ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە کتێبی (البداية والنهاية ۱۱۲/۱)دەربارەی گوتویەتی: (إسناده صحيح).

۲ ـ لە سەحیحی موسلیمدا ڕیوایەتێکی تر هەیە دەفەرموێ: (حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَيُؤْمِنُوا بِي وَبِمَا جِئْتُ بِهِ)لە ڕیوایەتێکی تریشدا، کە لە سەحیحەیندا هەیە هاتوە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ

واتە: هەرکەس بڵێ: (لا اله الا الله) و بڕوای بە پەرستراوی تر نەبێت، بێجگە لە خوا، خوێن و ماڵی حەرام دەبێت. یەکەم دروشمێکیش، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەڵکی بۆ بانگ کردبێت (لا اله الا الله) بوە، بۆیە بێ ئیمانانی قورەیش دەیان وت: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ﴾ص/٥ واتە: ئایا هەمو خواکانی کردوە بە یەك خوا، بەڕاستی شتێکی سەیرە! هەر بۆیە کاتێك مەعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن، پێی فەرمو: (إنّكَ تأتي قوماً مِن أهلِ الكِتاب، فليَكُن أوّلَ مَا تدعُوهُمْ اليهِ شهَادَةُ أن لا الهَ الا الله)رواه البخاری و مسلم[1] واتە: تۆ دەچیتە ناو کۆمەڵێك لە خاوەن پەیامەکان، با یەکەم شتێك، کە بانگیان دەکەیت بۆی شایەتی دانی (لا اله الا الله) بێت.. ئنجا هەرکەسێك وتی:لا اله الا الله و مەرجەکانی ڕەچاو کرد دەچێتە بەهەشتەوە، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إنّ اللهَ حَرّمَ علَى النّارِ مَن قالَ: لا اله الا الله، يَبْتغِي بذلِكَ وَجهَ اللهِ عزّ وَجلّ) رواه مسلم واتە: خوا ئاگری دۆزەخی لە کەسێك یاساغ کردوە بڵێ: (لا اله الا الله) و مەبەستی پێی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

---

النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، فَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ) ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی: جامع العلوم والحکم ١/٢٢٧).

١ ـ فەرمودەکە لە سەحیحی بوخاری لە کتاب المغازیدایە ژمارە (٤٠٨٦)و لە سەحیحی موسلیم (ژمارە ١٩)و ئەمەش بە سەنەدێکی تری لە فتح الباری یەوە، ژمارە (١٧٨٩): (قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمُعَاذِ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ هُمْ يَعْنِي أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ بِذَلِكَ فَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ).

## مەرجەکانی لا اله الا الله

هەرکەسێك شایەتی بدات و بڵێ: لا اله الا الله و ئەم مەرجانەی تێدا بێتە دی دەبێتە موسوڵمانی ڕاستەقینە:

یەکەم: زانینی واتاکەی: کە بریتییە لەڕەت کردنەوەی پەرستراویەتی غەیری خواو چەسپاندنی بۆ خوای گەورە، وەك دەفەرموێت: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ محمد/ ١٩ واتە: بزانە کە هیچ پەرستراوێك نییە، بێجگە لە خوا. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ مَاتَ وَهوَ يَعلَمُ انهُ لا الهَ الا الله، دَخَلَ الجنةَ)رواه مسلم[١] واتە: هەرکەس بمرێت و بزانێت، کە هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خوا، دەچێتە بەهەشتەوە.

دووەم: دڵنیابون: واتە بە دڵ بڕوای پێ بکرێت و هیچ گومانێك بەرانبەری نەمێنێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ ﴾الحجرات/ ١٥ واتە: هەر ئەوانە ئیماندارن، کە ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، پاشان گومانیشیان نەماوە[٢].

١ـمسلم:كتاب الإيمان/ باب الدليل على أن من مات على التوحيد دخل الجنة قطعًا(١/٥٥) ژمارە(٤٣).

٢ـ لە فەرمودەی پێغەمبەری خواشدا صلى الله عليه وسلم هاتوە کە (أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وأنِّي رسُولُ اللهِ، لا يُلْقِى اللهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيرَ شَاكٍّ فيهمَا إلّا دَخَلَ الجَنَّةَ )رواه مسلم: كتاب الإيمان، باب الدليل على أن من مات على التوحيد دخل الجنة قطعًا (١/٥٥ـ٥٧) ژمارە (٢٧). واتە: شایەتی دەدەم، کە هیچ خوایەك نیە شایانی پەرستن بێت جگە لە الله، هەروەها شایەتی دان بەوەی، کە من پێغەمبەری خوام، هەر عەبدێك بێ دودڵی و گومان بەم شایەتمانەوە بە خوای گەورە بگات، دەچێتە بەهەشتەوە...

سێیەم: ڕازی بون بە دڵ و زمان بەوەی لەم وشە پیرۆزە دەفامرێتەوە: خوای گەورە دەربارەی بێ ئیمانان دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾الصافات/٣٥ واتە: ئەگەر بەو بێ ئیمانانە بوترایە هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خوای گەورە، خۆیان بە زل دەزانی و لوت بەرزانە ڕەفتاریان دەكرد.

چوارەم: ملكەچ كردن و پابەند بون بە واتاكەیەوە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ﴾الزمر/ ٥٤ واتە: بگەڕێنەوەو بۆ لای پەروەردگارتان و مل كەچی ببن.

پێنجەم: ڕاستگۆیی لە ئیمان بون بە (لا الە الا اللە)دا: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾العنكبوت/١-٣ واتە: ئەلف، لام، میم، ئایا خەڵكی وای دادەنێن، كە وازیان لێ بهێنرێت، هەر بەوەندەی بڵێن: ئیمانمان هێناوە دەست بەرداریان ببین و تاقی نەكرێنەوە، بێگومان ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیكردوەتەوە، بۆ ئەوەی خوای گەورە بزانێت ئەوانە كێن، كە ڕاستیان كردوەو ئەوانەشی بۆ دەركەوێت، كە درۆزنن . پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم دەفەرموێت: (مَا مِنْ أحَدٍ يَشْهَدُ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ) متفق علیە[1] واتە: هەر كەسێك شایەتی بدات بەوەی

---

١ ــ ئەم فەرمودەیەلە بوخاریدا (كتاب العلم (١ /٢٢٦ )) ژ (١٢٨) ولە موسلیمدا (كتاب الإیمان(٦١/١ )) ژ(٣٢)فەرمودەی دیكەش لەو بارەوە زۆرە ، لەوانە:(عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامت رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ شَهِدَ أنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَأنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ) موسلیم (٢٩) .

هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خواو شایەتی بدات، کە موحەمـەد صلی الله علیه وسلم بەندەو نێردراوی خوایە، بە ڕاستگۆیی و لـە دڵـیەوە بێـت، ئەوا خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێ یاساغ دەکات.

شەشـەم: نیـاز پـاکی و دڵسـۆزی لـە وتـنی (لا الـە الا اللـە) دا: چـونکە پێغەمبەر صلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێت: (إنَّ اللهَ حَـرَّمَ عَلَـى النَّـارِ مَنْ قَالَ: لا الـهَ الا اللهُ يَبْتَغِـي بِـذلِكَ وَجْـهَ اللهِ عَـزَّ وَجَـلَّ)روا مسـلمٌ[1] واتـە: خـوا ئاگری دۆزەخی لە کەسێك یاساغ کردوە بڵێت: (لا الە الا الله) و مەبەسـتی پێی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

حەوتـەم: خۆشویسـتنی ئـەم وتـە شـیرینەو ناوەڕۆکەکـەی و ئەوانـەی پابەنـدی دەبـن و ڕق بونـەوە لەوانـەی سەرپێچـی و دژایـەتی دەکـەن: پیغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (ثلاث مَنْ كُنَّ فِيـهِ وَجَـدَ بِهِنَّ حَلَاوة الإيمانِ، أنْ يَكونَ اللهُ ورسُولَهُ أحَبَّ إلَيهِ مِمَّا سِواهُمَا، وَأنْ يُحِبَّ المَـرْءَ لا يُحِبُّهُ الا للهِ، وَأنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ فِي الْكُفرِ بَعْدَ اذْ أنْقَذَهُ اللهُ مِنهُ، كَمَـا يَكْـرَهُ أنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)متفق علیه[2] واتە: سێ سیفەت لە هەر کەسێکدا بن شـیرینی ئیمانی پێیان دەست دەکەوێت: خـواو پێغەمبەرەکـەی لـە لا خۆشەویسـتر بێت لە هەمو شـتێکی تـر، هـەر کەسـێکی خۆشویسـت لەبـەر خـاتری خـوا خۆشـی بوێـت، پێـی نـاخۆش بێـت، کـە بگەڕێتـەوە بـۆ بـێ ئیمـانیی، دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردوە لێی، هـەروەك، کە پێـی ناخۆشـە فـڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

---

- عن عِتْبَانَ بْن مَالِكٍ الْأَنْصارِيِّ رضي الله عنه أنَّ رَسُولَ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قَـالَ: (إنَّ اللَّـهَ قَـدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّه) بوخاری ژمارە (٤٢٥) وموسلیم ژمارە (٣٣).

١ـ بوخاری ژمارە (٤٢٥) وموسلیم ژمارە (٣٣).

٢ـ بوخاری/کتاب الایمان (١/٣٠) ژمارە (١٦)وموسلیم/ کتاب الایمان (٢/٢١٠) ژمارە (٤٣).

هەشتەم: ئیمان نەبون بە (طاغوت) و کوفرانە کردن پێی: تاغوت واتە: ئەو شتانەی بێجگە لە خوا، کە دەپەرسترێن. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ قَالَ: لا الهَ الا اللهُ، وَكَفَرَ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دونِ اللهِ، حَرُمَ مالُهُ و دمُهُ)رواه مسلم[1] واتە: هەر کەسێ بڵێ: لا اله الا الله و کوفرانە بەوانە بکات، کە دەپەرسترێن بێجگە لە خوا، ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت.

ئەمانە ئەو مەرجانە بون، کە پێویستە لە کەسێکدا بێنە دی، کە بڵێت: (لا اله الا الله)و بە پێی فەرمودەکان شایستەی بەهەشت بێت، حەوتیان لەم دێڕە شیعرەدا کۆ دەبنەوە:

علم، يقين، واخلاص، و صدقك مع .... محبة، وانقياد، و القبول لها

## هێنانەدی یەکخوا پەرستی ڕاستەقینە

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە یەکخواپەرستی پەرستراویەتی (توحيد الالوهية)، کە هەر دو بەشەکەی تریش دەگرێتەوە بێتە دی، دەبێت بەم خاڵانەی خوارەوە بگەنە ئەنجام:

### یەکەم: نیازپاکی و دڵسۆزی بۆ خوای گەورە لە پەرستندا.

ئەویش بە ڕەچاو کردنی ئەم خاڵانە دەبێت:

١ـ خۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ خوا: دەبێت موسوڵمان خۆشەویستی خوای گەورە هەمو قەوارەی دابگرێت و هەست و نەستی سەر لەبەر لەو خۆشەویستییەوە سەرچاوە بگرێت، بە پێچەوانەی بێ ئیمانەوە، کە خوای

---

١ ـ موسلیم ژمارە ٢٣ ، ئیمامی ئەحمەد ٣\٤٧٢.

گــەورە دەربــارەی دەفــەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾البقـرة/١٦٥ واتــە: لــە خەڵكیـدا کەسانێك هەن، کە بێجگە لە خوا هاوتای تر هەڵدەبژێرن، خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خـوا، بـەڵام ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە خوایـان زۆرتـر خۆش دەوێت.

٢ـ ترسانی ڕاستەقینە لـە خـوا: چونکە دەسـەڵاتی ڕەهـاو بـێ سنور لـە دەستی خوای گەورەدایەو کەسی تر بە وێنەی خوا دەستی بەسـەر مرۆڤـدا ناڕوات، ئنجا ئەگەر ترسـی هـەژاری، یـاخود مـردن، یـان ترسـی تێکشـکانی هـەبێت، هـەموی بـە دەسـتی خوایـەو هـیچ کـەس باڵادەسـت نییـە، خـوای گـــــــــــەورە دەفــــــــــــەرموێت: ﴿أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾التوبة/ ١٣ واتە: ئایا لە بێ ئیمانـان دەترسـن؟ خـوا لـە پێشـترە، کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە موسوڵمانن.

هەروەها دەربـارەی دو ڕوەکـان دەفـەرموێت: ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ﴾النسـاء/٧٧ واتــە: کاتێـك خـوای گـەورە کوشـتاری لەسـەر پێویسـت کـردن، یەکسـەر دەسـتەیەکیان ترسـیان کەوتـە دڵ و لـە خەڵکی دەترسان، بە ئەندازەی ترسیان لە خوا، یاخود زیاتریش) .

٣ـ بە تەنها ناسینی خوای گەورە لە پاڕانەوەو پشت بەسـتن و تکاکردن دا: بێگومـان لـەو شـتانەدا، کـە تـەنها خـوای گـەورە دەسـتی بەسـەریاندا دەڕوات، وەك دەفــەرموێت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾یـونس/١٠٦ واتــە: بێجگــە لــە خــوا لــە کەســی تــر مەپاڕێرەوە، لەوەی نە سـودت پـێ دەگەیـەنن و نـەزیان، ئەگـەر وا بکـەیت

ئەوا کەواتە تۆش لە ستەمکارانیت، یان دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾المائدة /٢٣ واتە: پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە موسوڵمانن، یاخود دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ ﴾البقرة/٢١٨ واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو ئەوانەی کۆچیان کردوەو جیهادیان کردوە لە پێناوی خوادا ئەوانە داخوازی میهرەبانی و بەزەیی خوان.

٤ـ ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن بە نیازپاکی بۆ خوا: چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾البينە/٥ واتە: فەرمانیان پێ نەکراوە بەوە نەبێت، کە خوا بە نیازپاکی بپەرستن و مل کەچی تەواوی بۆ دەربڕن و بە خاوێنی بیناسن و نوێژ ئەنجام بدەن.

٥ـ پیادە کردن و چەسپاندنی بەرنامەو شەریعەتی خوا: ئاشکرایە خوای گەورە سنوری حەڵاڵ و حەرامی دیاریکردوەو مرۆڤی موسوڵمانی پێوە پابەند کردوەو، بەرنامەی سەر لەبەری ژیانی بۆ نەخشە بەند کردوە، ئنجا ئەوەی لەسەر موسوڵمان بێت، تەنها مل کەچ کردن و پیادەکردنی ئەو شەریعەتە خواییەیەو، بە هیچ جۆرێك و بە هیچ پاساوێك بۆی نییەئەم لاو ئەولا بکات و پشتی لێ بکات، چونکە:

ا) خوای گەورە کاربەجێیەو فەرمانەکانی ڕەواو دروستن ودورن لە هەوەسکاری.

ب) وەك مرۆڤی دروست کردوە فەرمانیشی پێ دەکات و دەزانێت چی لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێت.

ج) خاوەنی زانایی و شارەزایی تەواوەو، ئاگای لە ڕابردو و ئێستاو داهاتو هەیە.

خوای کاربەجێ دەفەرموێت: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ﴾المائدة/٤٨ واتە: ئەی موحەمەد صلى الله عليه وسلم حوکمی نێوانیان بکە بەو پەیامەی، کە خوا ناردویەتی و شوێن ئارەزوەکانیان مەکەوە لە جیاتی ئەو ڕاستییەی کە بۆت هاتوە، بۆ هەر گەلێك لە ئێوە، ڕێبازو بەرنامەمان بۆیان داناوە)، یاخود دەربارەی دو ڕوەکان دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ﴾ النور/٤٧-٤٨. واتە: دەڵێن: ئیمانمان بە خواو بە پێغەمبەر هێناوەو گوێڕایەڵین، پاشان هەندێکیان دوای ئەوە پشت هەڵدەکەن، ئەوانە هەرگیز موسوڵمان نین، ئەگەر بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی حوکمی نێوانیان بکەن، دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن.

هەروەها سەبارەت بە جولەکەو دیانەکان دەفەرموێت: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾التوبە/ ٣١ واتە: مالوم(حبر)و قەشەکانیان کردوە بە خواکانیان و بێجگە لە خوای گەورە شوێنیان دەکەون.

کاتێك عەدیی کوڕی حاتەم خوا لێی ڕازی بێت لە شام گەڕابۆوەو هاتبوە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەم ئایەتەی خوێندەوە، عەدی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمان

دەپەرستن ؟ فەرموی: (أليسَ يُحِلُّونَ لكُمْ مَا حَرَّمَ اللهُ فتحِلُّونَـهُ، وَ يُحَرِّمُـونَ مَا أحَلَّ اللهُ فتحَرِّمونَه؟) واتە: مەگەر ئەوەی، کە خوا یاساغی کردبو بۆیان حەلاڵ نەدەکردن و ئێوەش بە حەلاڵتان دەزانی و ئەوەش، کە خوا حەلاڵی کردبو بۆیان یاساغ نەدەکردن، ئێوەش بە یاساغتان دەزانی؟ گوتی: بەڵێ، فەرموی: (فتِلْكَ عِبَادتهُمْ)رواه الترمذي وهو صحيح[1] واتە: (ئا ئەوە پەرستنیانە).

**دووەم: دەست بەردار بون و خۆ بەری کردن لە ( طاغوت ).**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾النحل/ ٣٦ واتە: لە هەمو ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردوە، کە پێیان ڕابگەیەنێت خوا بپەرستن و توخنی تاغوت مەکەون. یان دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾البقرة/ ٢٥٦ واتە: هەرکەس کوفرانە بە تاغوت بکات و ئیمان بە خوا بهێنێت، ئەوا دەستی گرتوە بە ڕشتەی قایمەوەو لێی جیا نابێتەوە، خواش بیسەرو زانایە. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ قالَ: لا الـهَ الا اللهُ، وَكَفرَ بمَا يُعْبَدُ مِنْ دونِ اللهِ، حُرِّمَ دَمُهُ و مالُهُ)مسلم[2] واتە: هەرکەس بڵێ:

---

١ـ نوسەری بەڕێز وای نوسیوە، کە سەحیحە، بەڵام نەمزانی چۆن حوکمی سەحیحی داوە ، بە هەر حاڵ نەمدۆزیەوە، کە سەحیح بێت، ئەوەی ترمزی لە (سنن الترمذي/ كتاب التفسير سورة التوبة ٥/ ٢٦٢ ژمارە ٣٠٩٥ )دا ریوایەتی کردوە بە (حەسەن)ی داناوە، هەروەها ئیمامی بەیهیقی لە (السنن الكبرى ١٠/١١٦)دا هێناویتیەوەو شێخی ئەلبانیش لە (صحيح الترمذي٣/ ٥٦) هەروەها لە (غاية المرام ل ١٩)دا بە حەسەنی ناساندوە.

٢ ـ لە پەراوێزی ژمارە ٩ دا ناسێنرا .

(لااله الا الله) و بێ ئیمانی بەوانە بکات، کە دەپەرسترێن بێجگە لە خوا، خوێن و ماڵی حەرام دەبێ. ئاشکرایە هەمو شتێك بە پێچەوانەکەیدا دەناسرێتەوەو جیا دەکرێتەوە، یەکخواپەرستیش نایەتەدی، هەتا بەندە دژو پێچەوانەی یەکخواپەرستیەکە نەزانێت، کە تاغوتە و تا لێی دور نەکەوێتەوە .

## واتای ( طاغوت ):

(طاغوت) وشەیەکە لە چاوگی (طغیان) وەرگیراوە، کە بە واتای لە سنور دەرچونە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ﴾الحاقة/١١ واتە: کاتێك ئاوەکە سەررێژی کرد، ئێمە لە کەشتییەکەدا هەڵمان گرتن.

پێشەوا عمر خوا لێی رازی بێت گوتویەتی: تاغوت شەیتانە . جابریش خوا لێی رازی بێت گوتویەتی: (تاغوتەکان جادو گەر بون، شەیتانەکان دەهاتن بۆ لایان . پێشەوا مالکیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرمویەتی: تاغوت هەمو شتێکە، کە لە جێی خوای گەورە بپەرسترێت .

ئەمانە هەمویان نمونەن لەسەر تاغوت . بەڵام واتایەکی لەوە گشتی تری هەیە، کە پێشەوا ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئاماژەی پێکردوەو فەرمویەتی: تاغوت: هەمو شتێکە، کە بەندە لە سنوری خۆی بەدەر دایبنێت لە (پەرستراو)، یان (شوێن هەڵگیراو) یان (گوێڕایەڵی کراو)، تاغوتی هەر گەلێکیش ئەو کەسەیە، کە بێجگە لە خواو پێغەمبەرەکەی دەیکەن بە دادوەر، یان بێجگە لە خوا دەیپەرستن، یان کوێرانە شوێنی دەکەون، یان لە شتێکدا گوێڕایەڵی دەکەن، کە نازانن

گوێڕایەڵی خوایەو پەرستنە.

بیریاری ئیسلامی ناودار محمد قوتب دەربارەی تاغوت دەڵێ: هەر شتێك، یان کەسێك، یان نەریتێك، یان بارو دۆخێك، یان دەسەڵاتێك، یان شەرعێك کە بە بێ مۆڵەتی خوای گەورە خەڵکی بکاتە کۆیلەو بەندەو داوا لە خەڵکی بکات گوێڕایەڵی بکەن، یان خەڵکی خۆیان مومارەسەی گوێڕایەڵی کردنی بکەن و بە گوێڕایەڵی کردنەکەی سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکەن، ئەوە تاغوتە..

## سەرانی طاغوت:

تاغوتان زۆرن، بەڵام سەرانیان ئەم پێنجەن:

یەکەم: ئیبلیس (شەیتان): چونکە یەکەم بەندەی یاخی و سەرکەشەو لە بەزەیی خوای گەورە بێ بەش کراوەو نەفرینی یەکجاری لێکراوە، بۆیە لە دەرفەت دەگەڕێت، تا بەندەکان لە خشتە بەرێت و سەرپێچی خوای گەورەیان بکەن.

دووەم: کەسێك بپەرسترێت و خۆشی بەوە ڕازی بێت: چونکە خەڵکی پێیەوە گیرۆدە دەبن و لە خوا پەرستی ڕاستەقینە دور دەکەونەوە، لە کاتێکدا ئەم بە ئاسانی دەتوانێت ڕێگری خەڵکی بکات لەو پەرستنەو دەست بەرداری ببن، لە ژیانیدا، یان لە دوای مردن .

سێیەم: کەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بیپەرستن: کەسێك کاری وای لێ بوەشێتەوە، بێگومان تەواو شوڵی لێ هەڵکێشاوەو یەکجار سەرکەشەو خۆی بە خوای خەڵکی داناوەو دوریان دەخاتەوە لە خوا پەرستی، ئنجا بە دەمیەوە بێن، یان گوێی پێ نەدەن هەر (تاغوت)ە.

چوارەم: کەسێك لاف غەیبزانی لێ بدات: چونکە بانگەشەی سیفەتێکی

چەسپاوی خوای گەورە بۆ خۆی دەکات و خەڵکی گومڕا دەکات و بیروباوەڕیان دەشێوێنێت.

پێنجەم: کەسێك حوکم بە غەیری بەرنامەی خوا بکات: ئاشکرایە لە ژیانی کۆمەڵگادا دو جۆر حوکمڕانی پیادە دەکرێت: یان حوکمی جاهیلی، یاخود حوکمی خوا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾المائدة/ ٥٠ واتە: ئایا مەبەستیانە حوکمی جاهیلی پیادە بکەن؟ باشە حوکمی کێ لە هی خوا چاکترە بۆ گەلێك ئیمانیان دامەزراو بێت)، جا کەسێك پیادەی حوکمی جاهیلی بکات لە ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکیدا، ئەوا گەلێك یاخییەو سەرکەشییەکەی دەگاتە بلەی تاغوت .

## یەکخوا پەرستی ناوو سیفەتەکان( توحید الأسماء والصفات )

واتە ئیمان بون بەوەی، کە خوای گەورە خاوەنی هەمو سیفەتێکی تەواوەو دورە لە هەمو سیفەتێکی ناتەواوی و کەم و کوڕییەوە، هەروەها بە تەنها ناسینی خوا لەو ناوانەدا، کە خۆی پێ ناوناون و لەو سیفەتانەدا، کە لە قورئاندا یان لە زمانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم خۆی پێ وەسف کردون، ئەوەش بە چەسپاندنیان و سەلماندنیان دەبێت بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیان، واتە: بە بێ شێواندن (تحريف) و مانا گۆڕکێ (تأويل) و بە بێ لەکار خستن (تعطيل) و چۆنایەتی (تكييف) و بەبێ لێچواندن (تشبيه) .

کەواتە هەتا ڕەچاوی ئەم خاڵانە نەکرێت، یەکخواپەرستی ناوو سیفەتەکان نایەتە دی:

١ـ بە دور گرتنی خوای گەورە لە هەمو لەکەو ناتەواوی و کەم و

کورییەك، ئەمەش وا دەخوازێت کە:

أ- خوای گەورە بە پاك ڕاگرین لە هاوسەرو هاوبەش و هاوتاو پشتیوانو تکاکار (بە بێ مۆڵەتی خۆی) و دۆست (لە لاوازییەوە) .

ب- خوای گەورە بە پاك ڕاگرین لە نوستن و بێ تاقەتی و ماندو بون و مردن و نەزانی و ستەم و بێ ئاگایی و بیر چونەوەو وەنەوزو لایەنگیریو.. هتد خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾سورة الإخلاص واتە: ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم بڵێ: خوای گەورە ئەو خوایەیە، کە تاك و تەنهایە، خوایەك جێگەی نیازە لە کاتی تەنگانەدا، کەسی لێ نەبوە و لە کەس نەبوە، هیچ کەس هاوتای ئەو نییە. یان دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ ...﴾البقرة/٢٥٥ واتە: هەر خوایەکە بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر نییە و زیندوی ڕاگیرکەرە، نە وەنەوز دەدات و نە خەو دەیباتەوە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە هی خۆیەتی، کێ هەیە بتوانێت تکای بە بێ مۆڵەتی خۆی لەلا بکات.

٢- ئیمان بون بەو ناوو سیفەتانەی، کە لە قورئان و سونەتدا هاتون بە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیان، وەك چۆن لە زمانی عەرەبیدا واتا دەبەخشن بەبێ زیادو کەم، کەواتە پێویستە موسوڵمان لەم خاڵانە بە دور بێت:

أ- شێواندن ( تحريف ) و مانا گۆڕکێ ( تأويل ): واتە لادان و گۆڕینی ناوەکە، یان سیفەتەکە لە واتاکەی خۆی وەك: لێکدانەوەی دەستی خوای گەورە بەهێز، یان لێکدانەوەی بالابون (استواء) ی خوا بەسەر عەرشدا بە دەست بەسەردا گرتن (استيلاء) یاخود خوێندنەوەی ناوی پیرۆزی (الله) بە

(منصوب) ی لە ئایەتی: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾النساء/ ١٦٤ واتە: خوا قسەی لەگەڵ موسادا کرد بە قسە کردن. بۆ ئەوەی بەر پەرچی سیفەتی (قسە کردن) ی خوای گەورە بدەنەوە، چونکە ئەگەر وشەی پیرۆزی (اللە) لە ئایەتەکەدا (منصوب) بێت واتە: موسا قسەی لەگەڵ خوا کرد.

**ب- لە کارخستن (تعطیل)**: واتە نکۆڵی کردن لە ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە بە بیانوی ئەوەی چەسپاندنیان دەبێتە هۆی لێچواندنی خوای گەورە بە دروست کراوەکانییەوە وەك: نکۆڵی کردن لە دەستی خوای گەورە، بۆ نمونە: هەندێك وتویانە: خوا توانای هەیە، بەڵام دەستی نییە، چونکە ئەگەر دەستی هەبێت ئەوا لە دروست کراوەکانی دەچێت، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ﴾ال عمران/٧٣ واتە: ئەی محمد صلى الله علیه وسلم بڵێ: ڕێزو چاکە بە دەستی خوایە، دەیدات بە هەر کەس خۆی بیەوێت. ئاشکرایە وشەی (دەست) بە ڕاشکاوی لە ئایەتەکەدا هاتوە،[1] بێگومان ئەو بیانوەی کە دەڵێن: چەسپاندنی ناوو سیفەتەکان دەبێتە هۆی لێچواندنی خوای گەورە بە دروست کراوەکانییەوە، لەبەر دو هۆ پوچ و بێ بناغەیە:

١- ئەو بیانوە وادەگەیەنێت، کە فەرمایشتەکانی خوای گەورە پێچەوانەی یەکترن، چونکە خوای گەورە ناوو سیفەتەکانی بۆ خۆی چەسپاندوەو دەفەرموێت:﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾الشوری/١١، واتە: هیچ شتێك بە وێنەی خوا نییە.

---

١ ـ هەروەها چەندەها ئایەتی دیکە هەن بەڵگەن لەسەر هەبونی دەستی خوای گەورە، وەك: ﴿ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ﴾الفتح:١٠ ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ یس: ٨٣ ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ﴾المائدە:٦٤ بلاوکار.

٢ـ مەرج نییە دو شت ناوەکانیان، یان سیفەتەکەیان بە بێژە (لفظ) وەکو یەك وابو ئیتر خۆشیان لە ماك و ناوەڕۆکدا لە یەکدی بچن، بێگومان سیفەتەکانی خوای گەورە بە جۆرێکن کە شایستەی شکۆمەندی ئەون و لە سیفەتی هیچ کام لە دروست کراوەکانی ناچن.

ج- چۆنایەتی (تکییف): واتە دەستنیشان کردنی چۆنیەتی و شێوەیەکی دیاریکراو بۆ سیفەتەکانی خوای گەورە.

د- لێچواندن (تشبیه): واتە لێچواندنی سیفەتەکانی خوای گەورە بە سیفەتی دروستکراوەکانییەوە وەك: لێچواندنی زاتی خوا، یان ڕوی خوا یان دەستی خوای گەورە بە هی دروستکراوەکانییەوە، بۆ نمونە: جولەکەکان دەیان گوت: دەستی خوا قونجاوەو نابەخشێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ﴾المائدة/ ٦٤ واتە: جولەکەکان دەیان وت: دەستی خوا قونجاوە، دەستیان بقونجێت و بەو قسەیە نەفرینیان لێ کراوە، بەڵکو هەردو دەستی واڵان و کراوەن، هەرچۆنێك بیەوێت دەبەخشێت)، ئاشکرایە هەر دەستی مرۆڤەکە دەقونجێت و چروکی دەکات، بەڵام دەستی خوای گەورە کراوەیەو لە هیچ ڕویەکەوە لە دەستی مرۆڤ ناچێت.

٣ ـ نیاز بڕین لە پەی بردن بە چۆنیەتی و ماکی سیفەتەکانی خوای گەورە، واتە: نابێ نە بەدڵ و نە بە بۆچون و نە بە زمان چۆنیەتی یان دەستنیشان بکرێت، بەڵام دەبێ چۆنیەتی ئیمان پێ بونیان بەم شێوەیە بێت:

أ- دڵنیا بین لەوەی هەریەك لەو ناوو سیفەتانەی، کە لە قورئان و سوننەتدا هاتون، ناوو سیفەتی خوای گەورەن.

ب ـ بزانین، کە هەر یەك لە ناوەکانی واتای سیفەتێك یان چەند سیفەتێکی خوای گەورە دەگەیەنێت و خاوەنی ئەو سیفەتەیە، بەڵام مەرج نییە هەر کام لە سیفەتەکانی ناوێك بن بۆ خوای گەورە، چونکە هەندێك سیفەت لە فرمانی خواوە وەرگیراوە، وەك: تورەیی .

ج- بزانین کە خوای گەورە بە واقیعی ئەو سیفەتەی تێدایە، بۆ نمونە: یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی (السمیع)ە واتە (بیسەر) ئنجا پێویستە ئیمانمان وابێت کە:

١) (السمیع) ناوێکی خوای گەورەیە.

٢) خوای گەورە سیفەتی بیستنی هەیە..

٣) بە واقیعی دەبیستێت و گوێی لە وتەو دەنگەکانە.

## ناوە جوانەکانی خوای گەورە( اسماء الله الحسنی )

خوای گەورە گەلێك ناوی جوان و پیرۆزی هەیە، ئەو ناوانە وەکو ناوی بەندەکان نین، چونکە ناونانی بەندەو دروست کراوانی خوا بۆ دو مەبەستە:

١ـ ناسرانەوەی لە نێوان هاوڕەگەزەکانی دا.

٢ـ جیاکرانەوەی لە غەیری خۆی.

بەڵام خوای گەورە بۆ ئەوە خۆی ناونەناوە بناسرێتەوەو نەگۆڕێت، چونکە هیچ هاوتایەکی نییە، نازناویشی لە خۆی نەناوە بۆ ئەوەی لە غەیری خۆی جیا بکرێتەوە، چونکە هیچ کام لە دروست کراوان لە خوای گەورە ناچن، خوای گەورە هاوشێوەی نییە، بەڵکو هەر ناوێك لە ناوەکانی، کە لە چاوگەیەکەوە وەرگیراوە واتای سیفەتێك، یان چەند سیفەتێکی

خوای گەورە دەگەیەنێت، بۆ نمونە ناوی (العلیم) واتە: زانا لە چاوگی (علم)ەوە وەرگیراوە، واتە: (زانین)، یاخود (القدیر) واتە: توانا لە چاوگی (قدرة)ەوە وەرگیراوە واتە: (توانین)، کەواتە: هەر ناوێك بەدیهاتنی (تحقیق) ی سیفەتەکەیەتی، ئنجا ناوێکی گشتی، کە واتای هەمو ناوەکانی تر بگەیەنێت، ناوی پیرۆزی (الله) یە، هەندێك لە زانایان گوتویانە لە بنەڕەتدا (الإلە) بووە (همزە)ی ناوەڕاستی لابراوەو دو (لام)ەکەی لێکدراون و بون بە (لام)ێکی گەورە، خوای گەورە دەربارەی ناوە جوانەکانی دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا﴾الأعراف/١٨٠ واتە: خوا خاوەنی ناوە جوانەکانە، بەو ناوانە لێی بپاڕێنەوە. هەروەها پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموێت: (إنَّ للهِ تِسعَةً وَتِسعِينَ اسمَاً، مِائةً الا وَاحِداً، مَنْ أحصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ، إنَّهُ وِترٌ يُحِبُّ الوِترَ)البخاري ومسلم[1] واتە: خوا نەوەدونۆ ناوی هەیە، لە سەد یەکێکی کەمە، هەرکەس بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە، خۆی تاکەو تاکیشی خۆش دەوێت.

مەبەست لە ژماردنی ناوەجوانەکان، کە موسوڵمانی پێ دەچێتە بەهەشتەوە:

یەکەم: لەبەرکردنیان: بەڵام پێویستە پێش ئەوەی لەبەریان بکات ساغیان بکاتەوەو بزانێت ئەو ناوانە کامانەن، کە لە قورئان و سوننەتدا هاتون.

دووەم: تێگەیشتن لە واتاکەیان: وابێت، کە ناوەڕۆکەکەیان تێبگات،

---

١ـ بوخاری ژمارە (٢٧٣٦) ، موسلیم ژمارە (٢٦٧٧) .. ئەم فەرمودەیە سێزدە یاوەر لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە خوا لێیان رازی بێت، لەوانە سەیدنا عەلی و سەلمان و ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس، فەرمودەی ئاحادە نەك متەواتر، وەکو ئیبنو عەتییەی ئەندەلوسی لە تەفسیرەکەیدا (المحرر الوجین) دا گوتویەتی، چونکە قسە لەسەر شەش حەوتێك لە سەنەدەکان هەیە، کە زەعیف بن ..

ڕاستترین ڕاڤەو لێکدانەوەش بۆ بینینی ناوە جوانەکانی خوای گەورە لە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و تێگەیشتنی هاوەڵان و سەرچاوەی ئیمان پێکراوی زمانی عەرەبییەوە دەست دەکەوێت.

سێیەم: پاڕانەوە لە خوای گەورە پێیان: پاڕانەوە بە ناوە جوانەکانی خوا بە دو مەبەست دەکرێت:

ا) پاڕانەوەی ستایش (ثناء): وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (اللهُمَّ أنْتَ الأوّلُ فلَيسَ قبْلَكَ شَيءٌ، وأنْتَ الاخِرُ فلَيسَ بَعْدَكَ شَيءٌ) صحيح الكلم الطيب: حديث/٣٤ [1] واتە: خوایە گیان تۆ یەکەمیت و هیچ شتێك لە پێشتەوە نەبوە، تۆ دواهەمیت و هیچ شتێك لە دواتەوە نییە.

ب) پاڕانەوەی داخوازی (طلب): وەك پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموێت: (ياحَيُّ، يا قيُّومُ، برَحْمَتِكَ أستَغِيثُ)اخرجه الترمذي وهو حسن [2] واتە: ئەی خوای زیندوی ڕاگیرکار بەبەزەیی و بەخشندەییت داوای فریاد ڕەسی دەکەم..

چوارەم: بە ئاگا بون لێیان: بەو واتایەی:

أ- کاتێك موسوڵمان بە زمان دەیانلێت بیریان لێ بکاتەوەو لێیان ورد ببێتەوەو بچێتە قوڵایی واتای هەر ناوێکەوە، کە لەسەر زمانیەتی.

---

١ ـ ئەمە لە کتێبی المستدرك علی الصحیحین/الحاکمدایە، (٢/٢٤٢ ژمارە ٨١٣)بەڵام لە سەحیحەیندا وا هاتوە: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ، أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ ، وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ )ئەمە لەفزی موسلیمە. شێخی ئەلبانی لە (السلسلة الصحيحة٣١٨٢)دا بە حەسەنی داناوە.

٢ ـ الترمذي (٣٥٢٤)، شێخی ئەلبانی لة (السلسلة الصحيحة ٣١٨٢)دا بە حەسەنی داناوە.

ب ـ چاودێری چاکی ناوەڕۆکەکەیان بکات و پارێزگاری سنورەکانیان بکات لە کاتی مامەڵە کردنی لەگەڵ خوای گەورەدا.

بۆ نمونە: کاتێك موسوڵمان دەڵێت: خوا ڕۆزی دەرە، نابێت کەس بە ڕۆزیدەر بزانێت و چاوەڕێی بژێوی لە هیچ کەسێکی ترەوە بکات، بێجگە لە خوای گەورەو نابێت تەنگاو بێ تاقەت بێ و بەو بەشەی خوا پێی دەدات، هەرچەندە زۆر کەمیش بێت و لە هیچ دروستکراو بەندەیەك نەترسێت، کە ڕۆزی لێ ببڕێت. هەرکەس بیەوێت بە چاکی لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە تێ بگات و شارەزا ببێت، پێویستە سەرنج لە نیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوا بدات لە بونەوەرو ژیاندا، وەك پێشەوا فەخر الرازی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ڕێگەی ناسینی خوای گەورە بریتییە لە شارەزا بون، لە کارو فرمانەکانی، ئنجا هەرکەس زیاتر لە نهێنی حیکمەتەکانی خوا ڕامێنێت لە دروستکراوەکانیدا، زۆر تر شارەزایی و زانیاری دەربارەی ناوەکانی خوا پەیدا دەکات.

## ناسینی خوای گەورە بە ناوەکانی:

ناسینی خوای پەروەردگار لە سەروی هەمو پێویستییەکەوەیە، چونکە بەختەوەری و کامەرانی ئادەمیزاد بەندە بە ناسین و پەرستنی خوای گەورەوە، و پەرستنی خوای گەورەش وەك پێویست بە تێرو تەسەلی و تامەزرۆییەوە نابێت، هەتا ناسینی خوای گەورە بە شێوەیەکی قوڵ و دامەزراو نەبێت، ئاشکرایە ناسینێکی ئاواش دەستەبەر نابێت، هەتا موسوڵمان بە تەواوی شارەزای ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگار نەبێت.

هەریەك لەناوو سیفەتەکانی خوای گەورە کاریگەریی و پەرێزی ڕۆشنو بەرچاوی لەسەر بونەوەرو ژیان هەیەو، هەر مرۆڤێکی موسوڵمان بە تێڕوانینێکی دروستەوەو لە ڕوانگەی ئەو ناوو سیفەتانەوە سەرنج لە ژیان و بونەوەر بدات بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی پەی بە ڕەنگدانەوەی هەریەکەیان دەبات لەسەریان و شوێنەواری ئەو ناوو سیفەتانەیان تێدا بەدی دەکات، بۆ نمونە: ناوی (الرحمن) واتە: (بەخشندە) و سیفەتی (الرحمة) (بەزەیی) بە ڕاشکاوی کاریگەریی و شوێنەواری لە دروست کراوەکانی خوادا بەرچاو دەکەوێت، هەر لە مرۆڤەوە، کە خوای گەورە لە سۆنگەی بەخشندەیی و بەزەیی خۆیەوە نرخی ژیانی پێداوەو شێوەی جوانی ژیان و ڕوخساری پێداوەو بەزەیی خستوەتە دڵییەوە، بەو پێیە مامەڵە لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیدا دەکات و پەیامی بۆ ڕەوانە کردوەو دروستکراوەکانی بۆ دەستەبەر کردوەو.. هتد. تاکو گیانەوەرو ئاژەڵ و دڕندەش، کە خوای میهرەبان بەزەیی لە دڵیاندا جێگیر کردوەو بەو پێیە پارێزگاری لە کۆرپەکانیان دەکەن و لە پێناویاندا ئەوپەڕی جەخت لە خۆیان دەکەن و ئالودەی هاو ڕەگەزی دەبن، ئا بەم تەرزە بیرکردنەوەو تێڕوانینە توانایی و کار بەجێیی خوای میهرەبان دەردەکەوێت و ئیمان جێگیر دەبێت.

## بەرهەمی ناسینی خوای گەورە بە ناوە جوانەکانی :

ناسینی خوای گەورە بە ناوەکانی، پێویستییەکی حاشا هەڵنەگرەو چەند بەرهەمێکی بە نرخیشی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:

یەکەم: هێنانەدی یەکخواپەرستی ڕاستەقینە بەوەی موسوڵمان خواست

و هیـوای نابەسـتێتەوە بـە غـەیری خـواوەو لـە کەسـی تـر ناترسـێت وبەندایەتی بۆ کەس ناکات.

دووەم: ئەگـەر موسـوڵمان بـە چـاکی پـەروەردگاری بناسـێت، غـەیری ئەویش دەناسێت، بەڵام کەسێك خوا نەناسێت، غـەیری خـواش بـە راسـتی ناناسێت.

سـێ یـەم: نـاوە جوانـەکانی خـوا هەریەکـەیان داخـوازی جۆرێـك لـە پەرستنن، ئنجا هەرکەس گرنگی بە هەر ناوێکیان بدات پەرستنی تایبـەت بەو ناوەی دەستگیر دەبێت، بۆ نمونە: کاتێـك موسـوڵمان بـیر لـە ناوەکـانی (القوي) واتە (بەهێز) و (القهار) واتـە (زاڵ)و (شـدید العقـاب) واتـە (تۆڵـە تونـد) بکاتـەوەو لێیـان تـێ بگـات ئنجـا ترسـان لـە خـوا، کـە جۆرێکـە لـە پەرستن دێتە بەرهەم و لە دڵیدا جێگیر دەبێت.

چوارەم: گومانی باش بردن بە خوا: کەسێك زۆر توشی تاقی کردنەوەو بەڵا ببێت و ئاگای لە ناوی (الحکیم) واتـە (کاربـەجێ) بێـت و تێـی بگـات نارەزایی بەرانبەر بە خوای گەورە دەر نابڕێت و گومانی خراپی پێ نابات و وا بزانێت، کە ستەمی لێ دەکات.

پێنجـەم: هەریـەك لـە ناوەکـانی خـوای گـەورە بەرانبـەرە لەگـەڵ پێویسـتییەکی دنیـایی، یـان قیامـەتی موسـوڵماندا، ئنجـا هەرکـەس پێویسـتییەکی هـەبێت، دەتوانێـت بـەو نـاوەی گونجـاوە لەگـەڵ پێویستییەکەیدا لە خوای گەورە بپاڕێتەوە .

**مەبەست لـە ناسینی خـوای گـەورە بـە ناوەکـانی:** هـەر وەك لـە باسـی ژمـاردنی ناوەکانی خـوای گـەورەدا باسـی چەند خاڵێکمـان کـرد، لێرەشـدا

ئاماژە بەم دو خاڵە دەکەین سەبارەت بە (مەبەست لە ناسینی خوای گەورە بە ناوەکانی):

١ـ هەریەك لەم ناوانە بکەینە تیشکۆیەك و بە هۆیەوە تەماشای شوێنەوارەکەی بکەین لە ژیان و بونەوەرداو پێی بگەینە قولایی ئیمان، تا سەرئەنجام بە ناسینێکی پتەو دامەزراو خوا بناسین .

٢ - هەوڵدان بۆ بەهرەمەند بون لە پرشنگی ئەو ناوە پیرۆزانەو خۆ قاڵکردنەوە بەو واتا بەنرخانەی لێیانەوە سەرچاوە دەگرن لە سنوری بەندایەتی مرۆڤدا.

**ڕاڤەی هەندێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوا:**

بۆ ئەوەی ئاشناییيەك دەربارەی گوڵزاری ناوە جوانەکانی خوای گەورە پەیدا بکەین، لێرەدا بە پێویستی دەزانین تیشك بخەینە سەر چەند ناوێکی پیرۆز، کە کاریگەری ڕاستەوخۆو سەرەکی یان لەسەر ژیانی مرۆڤ هەیە، ئەوانیش:

الخالق – الرزاق – الفتاح – الرقيب – القادر – المنتقم – الرافع – المميت.

ـ الخالِق: واتە (بەدیهێنەر: کردگار): ئەو خوایەیە کە بەدیهێنەرو داهێنەری دروستکراوەکانە، بە بێ بونی نمونەو شێوەیەك لە پێشتردا، ئەگەر بە ڕوانگەی مرۆڤانەی خۆمان بیر لە دروست کردن بکەینەوە، کە توانای هیچ جۆرە دروست کردنێکمان نییە بەم مەرجانە نەبێ:

ا- شێوەیەکمان لەبەر دەستدا بێت.

ب- کەرەستەی پێویستمان هەبێت.

ج- قەبارەو بارستایی و چۆنیەتییەکی سنوردار بێت.

د- مانەوەی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بێت.

ئەو کاتە تێدەگەین، کە خوای گەورە دروستکەرو بەدیهێنەری ڕاستەقینەی هەمو شتێکە بە کەرەستەو شێوەو بارستەو قەبارەو بەردەوامیەوە، هەر لە گەردیلەوە، کە یەکەی بنچینەیی پێکهاتنی بونەوەرە، تاکو سەرجەم زیندەوەران و گیانداران و مرۆڤ و زەوی و ئاسمانەکان و سەرجەم بونەوەر، خوای گەورە دروستی کردون و هەر خۆی شێوەی بۆ داناون و ڕێسای بەڕێوە چونی بۆ دیاری کردون و مانەوەو کۆتاییان هەر بەدەستی خۆیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴾الطور/ ٣٥-٣٦ واتە: ئایا لە هیچەوە دروست کراون؟ یان خۆیان دروست کەرن ؟ ئایا ئاسمانەکان و زەوییان دروست کردوە؟ بەڵام بە دڵنیاییەوە ئیمانیان نییە. کاتێك جوبەیری کوڕی مونعیم خوا لێی ڕازی بێت گوێی لەم ئایەتانە بو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیخوێندەوە، خۆی لەو کاتەدا هاوبەش دانەر بو، دەفەرموێت: خەریك بو دڵم دەفڕی، واتە دەستی بە لێدان کردو ئەوە یەکەمجاربو ئیمان لە دڵمدا جێگیر بو.

- الرزاق: واتە (ڕۆزیدەر): ئەو خوایەیە کە:

ا- هەمو جۆرە ڕۆزییەکی دروست کردوە.

ب- دەیدات بە هەمو دروست کراوەکانی.

ج- بڕی دیاری کراوی نییەلە ئەندازەیدا.

خوای گەورە بۆ دابین کردنی ڕۆزی سەر زەوی، چەندەها هۆکاری دەستەبەر کردوە لەوانە: خاك و ڕەگەزەکانی و ئاو گەرمی و.. هتد، ئنجا ڕۆزی خوای بەخشندە بەشی هەمو دروست کراوەکانی دەکات و بە

ئەندازەو ڕێژەو جۆری دیاریکراو دەیدات بە تێکڕایان و، هیچیان لێی بێ بەش نابن و ڕۆزییەکی هەمە ڕەنگە بۆ هەر ڕەگەزێك لەو دروست کراوانە، تاکو لەبەر چاویان نەکەوێت و لێی وەڕس نەبن، خوای میهرەبان بێ نیازە لە بەخشینی ڕۆزی فراوانی بە هەمو دروستکراوەکانی و بێ بەرامبەر پێیان دەبەخشێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ٥٧ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾ الذاريات/ ٥٧-٥٨ واتە: نە ڕۆزیم لێیان دەوێت و نە دەمەوێت خواردنم پێ بدەن، خوا خۆی ڕۆزی دەرەو خاوەنی هێزی قایم و لە بن نەهاتوە ئەگەر لە خۆمانەوە بڕوانین دەبینین لە ڕوی ڕۆزی دانەوە چۆن مامەڵە دەکەین و خوای گەورە چەندە خاوەنی منەت و چاکەو بەهرەو بەخشندەییە، چونکە لەگەڵ ئەوەی کە:

١ ـ نە دروستکەری خواردنین.

٢ـ نە دابین کردنی بە دەست خۆمانە .

٣ـ نە خاوەنی هیچ چاکەیەکین بەسەر خەڵکەوە .

بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە جێبەجێ کردنی مافی ڕۆزیدان و بەخشینی خواردندا:

ا) چروکی دەکەین.

ب) بە ئارەزوی خۆمان دەیبەخشین.

ج) بەخشینەکە بە نیازی شتێکە.

د) لەگەڵ بەخشیندا منەت دەکەین!

کەواتە: پێویستە داوای ڕۆزی و بژێوی هەر لە ڕۆزیدەی ڕاستەقینە بکەین و منەتبارو چاولەبەری خوای گەورە بین و شوکرانە بژێریی بۆ دەربڕین چونکە هیچ کاتێك فەرامۆشمان ناکات، نابێت کەسی تر بە سەرچاوەی ڕۆزی بزانین .

القــوي: واتــە: (بــەهێز): خوایــە، کــە توانــای تــەواوی بەســەر دروستکراوەکاندا هەیەو ئەوپەڕی هێزی هەیەو هەرگیز بێ توانـایی و بـێ هێـزی و دەستەوسـتانی ڕوی تـێ ناکـات، بـە واتایـەکی تـر خـوای گـەورە خاوەن هێزێکە کە:

١. بێ سنورو ڕەهایە.

٢. بەسەر هەمو شتەکاندا ڕادەگات.

٣. لە بن نەهاتوەو هەمیشەییە.

٤. کاربەجێ یی تەواو لە بەکارهێنانیدا هەیە.

هـەردو سـیفەتی دروسـت کـردن و ڕۆزیـدان، کـە پێشـتر باسمـان کـرد بەڵگەی ئاشکراو ڕونن لەسەر ئەوەی، کە هـیچ دەسـەڵاتێك نییـە هێنـدەی خـوای گـەورە بـەهێز بێـت، بـەڵکو هـەر خـۆی بـە تـەنها ئەوپـەڕی هێـزو دەسەڵاتی هەیەو شایستەیە موسوڵمان ملکەچی بێ و بیپەرستێت، واتـە پێویستە کاریگـەری هـەر هێـزو دەسـەڵاتێکی تـر لەسـەر هەسـت و هۆشـی خـۆی دارنێـت و نـەیکات بـە کانگـای ئاڕاسـتەو ڕوگـەی بڕیـار، بـەڵکو سەنگییەکەم بدات بە ئیمان بە خوای گەورەو لـە ناوەنـدی ئـەو ئیمانـەوە ئاڕاسـتە وەربگرێـت، چـونکە ئەگـەر ژیـانی کامـەرانی دەوێـت ئـەوا ژیـانی مـردنی بەدەستەو بەختەوەری دنیاو دواڕۆژی لەلایە، ئەگەر ڕۆزی دەوێـت ئەوا گەنجینـەی ڕۆزی هـەمو دروسـت کـراوان هـی خۆیـەتی و، هـەر خـۆی توانایی ڕۆزی دانی هەیە، ئەگەر پشتیوانی دەوێـت ئـەوا هـەر خـوا هێـزو دەسەڵاتی ڕەهاو بێ سنوری هەیەو زاڵە بەسەر هەمو دروستکراوانیدا.

الفتاح: واتە (دەرو کەرەوە): ئەو خوایەیە کە:

ا) دەروی خستوەتە نێوان ڕەوا (حق)و ناڕەوا (باطل)ەوەو لێکـی جـودا کردونەوەو ڕەوا سەر دەخات و ناڕەوا تێك دەشکێنێت.

ب) حوکمڕانی بەندەکانی دەکات و بە دادێکی ڕەوا دادوەری نێوانیان دەکات.

ج) دەروی بەزەیی و لێخۆشبون وڕۆزی دان لە بەندەکانی دەکاتەوەو هەر گرفتێکیان بێتە ڕێ بۆیان چارەسەر دەکات ودەروی نارەحەتی گوشاد دەکات.

ئاشکرایە ئەم ژیانە گۆڕەپانی ململانێ و کێشمەکێشمی نێوان ڕەواو نارەوایەو موسوڵمان هەمیشە توشی ناسۆرو ژان و ئازارو گیروگرفت و هەژاری و ستەمکاری دەبێت، حەتمەن لەم ڕێیەشدا پێویستی بە پشتیوانێکی بە هێزە سەری بخات و ڕێنمایی بکات و دەروی لێ بکاتەوە، چونکە کێشەو مەینەتییەکان لە ئەندازەی توانای مرۆڤ بەدەرن، ئنجا خوای گەورە بەهێزترین پشتیوانەو خاوەنی تواناو دەسەڵاتی بێ سنورەو هەر خۆی شایستەی ئەوەیە موسوڵمان پشتی پێ ببەستێت، تاکو بەرەی نارەوایی تێك بشکێنێت بۆی و مل ملانێی نێوان موسوڵمان و بێ ئیمان یەکلا بکاتەوەو موسوڵمان سەر بخات و دەروی ڕۆزی و بەزەیی و لێخۆشبونی لێ بکاتەوەو لە تەنگانەی هەژاری و نەخۆشی و ژێر دەستەیی و شکست و پەژارەو کۆست کەوتن دەربازی بکات و بە ئاسانترین شێوەو زوترین کات ڕەوتی ڕوداوەکان و سەرچاوەی کێشەو گیروگرفتەکان بەلایەکی لەباردا بخات و سەرفرازی بکات.

الرقیب: واتە (چاودێر): ئەو خوایەیە، کە زاناو پارێزەرەو هیچ زانیارییەکی سەبارەت بە دروست کراوەکانی لێ ناشاررێتەوەو پاراستنی هیچ کام لە دروست کراوەکانی لە دەست دەرناچێت .

بەو پێودانگەی، کە هەر خوای گەورە دروست کەرو مشور خۆرو دەسەڵات دارەو بونەوەری دروست کردوەو ڕێسای بەرێوەچونی بۆ داناوەو

ژیانی دەستەبەر کردوەو پێداویستییەکانی دابین کردوەو بەندەکانی بەدی هێناوەو هەمو دەوروبەری بۆ ژێر بار کردون، بێگومان:

ا) چاودێری بونەوەرو دەکات و ئاگای لە هەمو گۆڕانکارییەکانیەتی و پارێزەریەتی لە تێك چون و لە ناو چون .

ب) چاودێر ژیان دەکات و ئاگای لە سەرجەم پێداویستییەکانیەتی، لە ڕۆزی و بارو دۆخ و چۆنیەتی بەڕێوە چونی و ڕێژەی ژیان و مردن و.. هتد.

ج) چاودێری بەندەکان دەکات بۆ دو مەبەست:

١ـ پاراستنی ڕەوتی بەڕێوەچونی ژیانیان.

٢ـ هەڵسەنگاندن و مەزندە کردنی ڕاددەی پابەند بونیان بە ڕێبازی پەروەردگاریانەوە.

القادر: واتە: (بە توانا): ئەو خوایەیە، کە هیچ شتێ دەستەو سانی ناکات و بۆ هیچ دانامێنێت، چونکە: هەرچی بیەوێت و هەرچۆنێك ئارەزو بکات و لە هەر کاتێکدا ویستی بێت ئەنجامی دەدات و پێویستی بە هیچ هۆکارو هەوڵێك نییە، ئاشکرایە کاتێك خوای گەورە ژیان و بونەوەری ڕاگرتوەو لە ژێر چاودێری خۆیدان حەتمەن بە ویستی خۆشی (توانا) یە، کە هەر ئاڵو گۆڕو تەسەڕوف (تصرف)ێکیان تێدا بکات، بێ ئەوەی هیچ کام لەم جۆرو چۆنیەتی و کات و شێواز ببنە بەربەست لە ڕێیدا . بە واتایەکی تر: ڕاستە خوای گەورە ڕێسای بۆ ژیان و بونەوەر داناوە، بەڵام ئەمە واناگەیەنێت، کە ئیتر هەرگیز خوای گەورە ئاڵوگۆڕیان تێدا ناکات، بەڵکو بەخواستی خۆی چۆنی بوێت ئاوایان لێ دەکات .

کەواتە موسوڵمان نیازی هەر شتێکی هەبێت و بیەوێت باری ژیانی هەر چۆنێك بێت و داخوازی بەسەر چونی هەر تەنگانەو ئاستەنگێك بێت، پێویستە چاوی لە بەخشندەیی خوای گەورە بێت و هانای بۆ بەرێت و پشتی پێ ببەستێت.

المنتقم: واتە (تۆڵە ستێن): ئەو خوایەیە، کە خاوەنی تۆڵەی بە زەبرو کاریگەرە بەرانبەر هەریاخی و گومڕایەك کە لە فرمانی دەرچێت و هەر کەم تەرخەمێك، کە مافەکانی پشت گوێ بخات،
تۆڵەی خوای گەورە ئەم سێ شێوەیەی هەیە:

ا) بۆ خاوێن کردنەوەو سڕینەوەی گوناهە: وەك هەژاری و گیرو گرفت و ئازارو... هتد،کە پێی دەگوترێت(ابتلاء) واتە: (تاقی کردنەوە)، یان (مصیبة) واتە: بەڵاو مەینەت.
ب) بۆ سەرکۆنەو تەمبێ کردن و لەناوبردن و تیاچونە: وەك قاتوقڕی و نەخۆشی وجەنگ وکوشتاری بە کۆمەڵ و تیاچون کە پێی دەگوترێت (هلاك).

ج) بۆ ڕسوا کردن و خاکە سارییە: وەك سزای گۆڕو شکاندنی ڕۆژی لێپرسینەوەو سزای نەبڕاوەو هەمیشەیی دۆزەخ، بێگومان تۆڵەی خوای گەورە بۆ هەر کەسێك بە گوێرەی ڕادەی سەرکەشی وکەم تەرخەمی و یاخیبونیەتی.

کەواتە: پێویستە موسوڵمان ئاگای لێ بێت بەرانبەر مافەکانی خوای گەورە کەم تەرخەمی نەکات و پشت گوێیان نەخات، تاکو بە جۆرێك خوای پەروەردگار تاقی نەکاتەوە، کە بەرگەی نەگرێت و لێی دەر نەچێت.

هەروەها سەرکەش و ستەمکاریی نەکات و یاخی نەبێت، هەمیشە پەنا بە خوای گەورە بگرێت، تاکو نە لە دنیادا توشی تیاچون ببێت، نە لە ڕۆژی دوایشدا ڕسواو شەرمەزاری بەردەمی خوای گەورە ببێت.

الرافع: واتە: (بەرز کەرەوەو بڵندکار): ئەو خوایەیە، کە لەسەر پابەند بون و مل کەچ کردن بۆ فەرمانەکانی پلەو پایەی موسوڵمانان بەرز دەکاتەوە.

هەروەك خوای گەورە تۆڵە لە یاخی و ستەمکار و سەرکەش دەکاتەوەو ڕێگەیان نادات لە سنوری خۆیان تێپەڕ بکەن، بەهەمان شێوە لە پاداشتی گوێڕایەڵی و فەرمانبەریەتی و بە مشوریدا پلەو پایەی موسوڵمان بلند دەکاتەوە. لەو شتانەش، کە پلەو پایەیان پێ بەرز دەبێتەوە ئیمان و زانست و کردەوەی چاکن، پلەی بەرزیش گەلێك جۆری هەیە لەوانە:

١ـ کامەرانی و بەختەوەری.
٢ـ پێشەوایەتی کردن.
٣ـ هێزو دەسەڵاتی دادگەرانە.
٤ ـ لێبوردن و لێخۆش بون.
٥ـ پلە بەرزەکانی بەهەشت.

هەرچەندە مرۆڤ دڵی ببەستێتەوە بەو شتانەوە، کە بەرزی و بەختەوەری و خۆشی، یان تێدا دەبینێتەوە، هێشتا بە شێوەیەکی ڕاستەقینە بە دەستیان ناهێنێت مادام سەرچاوەی ئەو شتانە بە پێی فەرمانی خوای گەورە نەبێت، چونکە ئەو دڵەی پەیوەست بێت بەو شتانەوە، کە گۆڕانیان بەسەردا دێت لە ڕاڕایی ناکەوێت بەڵام ئەو دڵەی پەیوەست بێت بە خوای گەورەوە دامەزراو هێمنە، چونکە خوای گەورە زیندوەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، هەروەها بەهرەو بەخشینەکانی هەتا سەرن و پلەی بەرزی کامەرانیش هەر لە خوای گەورەوەیە.

هەر بۆیە موسوڵمان پلەی بەرزی دەسگیر دەبێت، چونکە ئیمانە کە لە خوای گەورەی نزیك دەخاتەوە، هەرکەسیش لە خوا نزیك بێت، بێگومان پلەی بەرزە.

المميت: واتە (مرێنەر): ئەو خوایەیە، کە بە ویستی خۆی دروست کراوەکانی دەژیێنێت، هەتا ئەو ماوەیەی بۆی دیاریکردون و بە ویستی خۆی هەر کاتێك بیەوێت دەیان مرێنێت .

بێگومان مادەم دروست کردن و ڕۆزیدان و ژیاندن بە دەست خوای گەورە بێت، بێگومان مراندنیش، هەر تەنها بەدەست خوای گەورەیە، هەروەك لە باسی ناوی (الرقیب) واتە: (چاودێر) دا ئاماژەمان بۆ کرد، خوای گەورە (چاودێری ژیان دەکات و ئاگای لە سەرجەم پێداویستییەکانیەتی، لە ڕۆزی و بارو دۆخ و چۆنیەتی بەڕێوە چونی و ڕێژەی ژیان و مردن و.. هتد).

کەواتە وەك چۆن ژیاندن و هۆکارەکانی هەر بەدەست خوای پەروەردگارە، بە هەمان شێوە مراندن و هۆکارەکانیشی هەر بە دەست خۆیەتی.

ئنجا دەبێت لە هەمو سات وسەردەمێکدا مردن بە ئامادەو نزیك بزانین و لێی بە ئاگا بین و خۆمانی بۆ ئامادە بکەین وبە هیچ سەرمایەیەك دەست خەرۆ نەبین.

هەروەها بێجگە لە خوای گەورە هیچ کەس بە مرێنەر نەزانین و سڵی لێ نەکەینەوەو سەری بۆ نەوی نەکەین، هەرچەندە بە ڕواڵەت خاوەنی دەسەلات و زەبرو زەنگ بێت و خەڵکی چاو ترسێن بکات.

## بەندی سێیەم: هاوبەش دانان (شیرك)

پێویستە بزانین هاوبەش دانان بە شێوەیەکی گشتی لە چ ڕویەکەوە دروست دەبێت، ئنجا خۆمانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی نەکەوینە هاوبەش دانانەکەوە.

هاوبەش دانان لە دو بواری سەرەکییەوە دروست دەبێت:

### یەکەم: لە بیروباوەڕدا واتە: (ألإعتقاد): ئەمیش دو جۆرە:

أ) هاوبەش دانان لە کردەوەکان (افعال)ی خوادا: وەك ئیمان بون بەوەی، کە پیاو چاك دەتوانێت دەست بخاتە کارو باری بونەوەرەوە، یاخود مشوری دەخوات، یان باران دەبارێنێت، یان نەخۆش چاك دەکاتەوە، یاخود دەتوانێت زیان بگەیەنێ و سود ببەخشێت . یان ئیمان بون بەوەی ڕۆژو مانگ و بت و دارو بەردو گوێرەکەو مانگا، یان جنۆکەو شەیتانو فریشتە، یان مرۆڤ وەك (فیرعەون و بوزا) دەتوانن فەرمانەکانی خوا ئەنجام بدەن، خوای گەورە لەسەر زمانی (ابراهیم) پێغەمبەرەوە سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ٧٨ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ٧٩ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ﴾ الشعراء/ ٧٨-٨٠ واتە: پەروەردگارم ئەو خوایەیە، کە منی بەدەیهێناوە و ڕێنمایم دەکات، ئەو خوایەی خواردنم دەدات و تێر ئاوم دەکات، ئەگەر نەخۆش کەوتم چاکم دەکاتەوە.

ب) هاوبەش دانان لە سیفەتەکانی خوادا: وەك ئیمان بون بەوەی پێغەمبەران، یان پیاو چاکان، یان جادو گەرو سیحر بازان، غەیب دەزانن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا

ٱللَّهُۚ ﴾النمل/ ٦٥ واتە: ئەی موحەمەد صلى الله عليه وسلم بڵێ: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی دا بێت غەیب نازانێت بێجگە لە خوا. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (لا يَعلَمُ الغَيبَ الا الله)رواه الطبراني، وهو حديث حسن[1] واتە: کەس غەیب نازانێت بێجگە لە خوای گەورە.

یاخود ئیمان بون بەوەی دەبێت یەکێك هەبێت لە نێوان خوای گەورەو بەندەکەیدا بۆ ئەوەی لێی خۆش ببێت، یان نزاو پاڕانەوەی گیرا بکات، یاخود یارمەتی بدات، وەك چۆن ناتوانرێت دەسەڵاتدارێك ببینرێت، یان داخوازییەکی لێ داوا بکرێت بە هۆی یەکێکەوە نەبێت، بێگومان ئەوە لێچواندنی (تشبية)ي خوای گەورەیە بە ئادەمیزادەوە لە سیفەتەکانیدا، خوای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾الشورى /١١ واتە: هیچ شتێك بە وێنەی خوا نییە.

**دووەم: لە شوێن کەوتندا واتە (شرك الإتباع): ئەمیش دو جۆرە:**

أ) هاوبەش دانان لە پەرستندا: وەك پاڕانەوەو نوێژ کردن و ڕۆژو گرتن و قوربانی سەربڕین و نەزر کردن و کڕنوش بردن و ترسان و خۆشویستن و.. هتد خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ﴾الأنعام/ ١٦٢ واتە: (ئەی موحەمەد صلى الله عليه وسلم بڵێ: نوێژ کردنم و قوربانی سەربڕینم و ژیان و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانە، هیچ هاوبەشێکی نییە. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (قالَ اللهُ تعالى: أنا أغنى

---

١- ریوایەتی سەیدنا سەلەمەی کوڕی ئەکوەعە خوا لێی رازی بێت .. ئەوەش سەرچاوەکانێتی: (الطبراني/المعجم الكبير (٦٢٤٥)، الحاكم/المستدرك (١٤). الهيثمي له مجمع الزوائد (١٣٨٦٩)دا دەڵێ: رجاله رجال الصحيح . ئیمامی الذهبيش له التلخيصدا دەڵێ: على شرط مسلم).

الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أشْرَكَ مَعِي فِيهِ غَيرِي، تَرَكْتُهُ وَ شِرْكَهُ)حديث قدسي، رواه مسلم[1] واتە: خوای گەورە فەرمویەتی: من دەوڵەمەند ترینی هاوبەشانم، کە پێویستم بە هاوبەش دانان نییە، هەر کەس کارێك بکات و غەیری من بکات بە هاوبەش لە گەڵمدا، واز لە خۆشی وهاوبەش دانانەکەشی دەهێنم .

ب) هاوبەش دانان لە یاساو ڕێسادانان (تشریع)دا: واتە: دانانی غەیری خوا بە یاسادانەر، بە جۆرێك حەرامی خوا حەڵاڵ بکات و حەڵاڵ حەرام بکات و بە ویست و ئارەزوی خۆی یاساو دەستور دابنێت و بەرنامەو پەیڕەوی فیکری دیاری بکات و خەڵکی شوێنی بکەون و پابەندی بن، وەك چۆن بڕوادار پابەندی بەرنامەی خوا دەبێت، ئنجا ئارەزوی خودی مرۆڤەکە بێت، یاخود نەریتێکی کۆمەڵایەتی بێت، یا ڕێ و ڕەسمێکی هۆزو تیرە بێت، یان پەیڕەو ڕێبازێکی حیزبیی بێت، یاخود یاساو دەستورێکی دەوڵەتی بێت، وەك یەك وایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾الشوری/٢١ واتە: ئایا هاوبەشی تریان هەیە، بێجگە لە خوا، کە ڕێبازو ئاینی تریان بۆ دابنێن لەوانەی خوا مۆڵەتی پێ نەداون .

## جۆرەکانی هاوبەشدانان:

هاوبەش دانان دو جۆرە: هاوبەش دانانی گەورە (الأکبر)و هاوبەش دانانی بچوك (الأصغر).

هەریەك لەم دو جۆرە دەچێتە چوارچێوەی خاڵەکانی پێشوەوە، بەڵام حوکمی هەر یەکەیان بە پێی دەرئەنجامەکەی جیاوازە و قوڵ بونەوەی

---

[1]ـ موسلیم (٢٩٨٥).

زیاتری تێدایە، واتە: بە شێوەیەکی گشتی هاوبەش دانان، کە لەو بوارانەی پێشووەوە سەرچاوە دەگرێت، دەکرێت بە دو جۆرەوە:

**یەکەم: هاوبەش دانانی گەورە (الشرك الاكبر).**

ئەو هاوبەش دانانەیە، کە بە تەواوی بیروباوەڕی یەکخواپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوەو خوای گەورەش لێی خۆش نابێت و، خاوەنەکەی ناچێتە بەهەشت و نمونەی ئەم جۆرە زۆرن لەوانە:

أ) پاڕانەوە لە غەیری خوا: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشْرِكُ بِهِۦٓ أَحَدًا﴾الجن/ ٢٠ واتە: ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم بڵێ: تەنها لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوەو هیچ کەس ناکەم بە هاوبەشی. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (الدُعاءُ هُوَ العِبَادَةُ)رواه الترمذي و قال حسن صحيح[١] واتە: نزاو پاڕانەوە پەرستنە.

ب) سەربڕین بۆ غەیری خوا: چونکە خوای گەورە بە پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم دەفەرموێت: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴾الكوثر/٢ واتە: نوێژو قوربانی بۆ پەروەردگارت بکە، پێغەمبەریش صلى الله عليه و سلم دەفەرموێت: (لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيرِ اللهِ)رواه مسلم واتە: نەفرینی خوا لەو کەسە بێت، کە قوربانی بۆ غەیری خوا سەردەبڕێت.

ج) ترسان لە غەیری خوا: واتە: ترسێك، کە لە بیروباوەڕەوە سەرچاوە بگرێت وەك ئەوەی مرۆڤ لە مردو، یان لە غائیب، یاخود لە مەرقەد

---

١- ریوایەتەکە (إِنَّ الدعاءَ هُو العِبادَةُ)یە، کە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوەیەو سەحیحە و ریوایەتی ئیمامی ئەحمەدو ترمزی و ئەبوداودو نەسائی و ئیبنو ماجەو ئیبنو ئەبی شەیبەو ئیبنو حیببانەو حاکم و ترمزی بە سەحیحیان ناساندوە، ئیمامی ئەوەویش دەڵێ اسنادە صحیح .. هەر بەم بۆنەشەوە ریوایەتی (الدُّعاءُ مُخُّ العِبادةِ)کە بەناوبانگە، زەعیفە...

بترسێت، کە توشی زیانی بکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾الزمـر/ ٣٦ واتـە: ئایـا بـەس نییە، کە خوا لە پشت بەندەکەیەوە بێت؟ بەو بت و پەرستراوانە دەت ترسێنن کە بێجگە لە خوا دەیانپەرستن .

د) ئیمان بون بەوەی خوا کوڕ یان کچ یاخود یاریدەری هەیە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾الأنعام/١٠٠ واتە: هاوبەشی جنۆکەیان بۆ خوا داناوە، هەرچەندە خواش دروستی کردون، بوهتانی کوڕو کچی بۆ دەکەن بە نەفامی وەك (عوزێر)و (مەسیح)و (فریشتە)، پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی، کە خوای پێ وەسف دەکەن.

ه)حەڵاڵ کردن یان حەڕام کردنی شت بە پێی ئارەزو: واتە: بزانێت خوای گەورە شتێکی حەڕام کردوە، بەڵام بە خواستی خۆی، یان بە خواستی کەسێکی تر بە حەڵاڵی بزانێت، چونکە خوای گەورە لە وەسفی هاوبەش دانەراندا دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ﴾النحل/ ٣٥ واتە: ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دانابو دەیان گوت: ئەگەر خوا بیویستایە بێجگە لە خۆی، هیچ شتێکی ترمان نە دەپەرست ـ نە ئێمەو نە باوباپیرانمان ـ وە بە بێ ویستی خۆی هیچمان حەڕام نەدەکرد.

## دووەم: هاوبەش دانانی بچوك (الشرك الأصغر).

بریتییە لەو تاوانە گەورانەی مەترسی یان لێ دەکرێت خاوەنەکانیان بە بێ ئیمانی بمرێت، ئەگەر خوای گەورە فریای نەکەوێت و پێش مردنی تەوبە نەکات، ئەمیش دو جۆرە: ئاشکراو شاراوە:

أ- هاوبەش دانانی ئاشکرای بچوك: ئەم جۆرەیان نمونەی زۆرە، لەوانە:

١) سوێند خواردن بە غەیری خوا: چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ حَلَفَ بِغَيرِ اللهِ، فَقَدْ كَفَرَ أو أشْرَكَ)رواه أحمد والترمذي و الحاكم وهو حسن[١] واتە: هەرکەس سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوا کافر دەبێت، یان هاوبەشی داناوە. ابن مسعود خوا لێی رازی بێت دەفەرموێت: ئەگەر بە درۆ سوێند بە خوا بخۆم پێم چاکترە لەوەی بە ڕاستی سوێند بە غەیری خوا بخۆم . چونکە: ڕاستە سوێند خواردنی درۆ بە خوای گەورە تاوانی گەورەیە، بەڵام سوێند خواردنی ڕاستی بە غەیری خوا هاوبەش دانانی بچوکەو لە تێڕوانینی هاوەڵە زاناکان (علماء الصحابة) دا لە هەمو گوناهێکی گەورە گەورەترە، زانایانیش ڕەحمەتی خوایان لێ بێت یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، دروست نییە سوێند بە غەیری خواو ناوو سیفەتەکانی بخورێت.

٢) هەڵواسینی (تەمیمە): واتە: ئەوشتانەی بە زۆری بە منداڵ (وەك نوشتەو موتفەڕك)و خانودا (وەك ناڵ وقۆچ)هەڵ دەواسرێن، بە بیانوی ئەوەی جنۆکە دور دەخەنەوە، یاخود ناهێڵن چاوەزار کاری لێ بکات وەك: موروە شینەو هێلکە شەیتانۆکەو شاخە بزن ولاخ و.. هتد، بێگومان ئەم

---

١ ـ الالباني: صحيح سنن الترمذي (ب ٦/ ل ١٣ ژمارە ١٤٥٥)، الإرواء (٢٥٦١)، الصحيحة (٢٠٤٢).

كردەوەیـە، بـێ متمانەیییـە بـە خـوای گـەورەو پشـت نەبەسـتنە بـە دروسـتكاری بونـەوەرو بـڕوا بونـە بـەوەی غـەیری خـوا سـودو زیـان دەگەیەنێت، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾الأنعـام/ ١٧ واتـە: ئەگـەر خـوا توشی زیانێكت بكات، ئـەوا هـیچ كـەس ناتوانێت لێت دور بخاتـەوە خـوا خۆی نەبێت، ئەگەر توشی خێرێكت بكات ئەوا خوا توانایە بەسـەر هـەمو شـتێكدا.. پێشـەوا ئەحمـەد ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێت لـە عوقبـەی كوڕی عامرەوە بـە (مـەرفوع)بۆمـان دەگێڕێتـەوە، كـە پێغەمبـەر صلى الله علیـە وسلم فەرمویەتـی: (مَنْ تعَلَقَ تمِيمَةً فَلا أتـمَّ اللهُ لـَهُ، وَمَـنْ تعَلـَقَ وَدْعَـةً فَلا وَدَعَ اللهُ لهُ )[1] واتە: هەركەس تەمیمەیەك هەڵواسێت خوا خێری نەهێنێتە ڕێ، هەركەس وەدعەیەك[2] هەڵواسێت خـوا ئاگاداری نـەبێت و پارێزگاری لێ نەكات، لە ڕیوایەتێكدا هاتوە: (مَنْ تعَلَقَ تمِيمَةً فقَدْ أشْـرَكَ) رواه أحمـد وهو صحيح[3] واتـە: هەركـەس تەمیمەیـەك هەڵواسـێت، ئـەوا هاوبەشـی بـۆ خوا داناوە[4].

---

١ـ ئیمامی ئەحمەد (١٦٩٥١) شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە (ضعیف الجامع ذمارة ٥٧٠٣) بە زەعیفی داناوە...

٢ـ (ودعە) جۆرێكە لـە (تەمیمـە) بەهـەر شـتێكدا هەڵواسرێت بـە نیـازی ئەوەیـە ئاگـاداری بێت و شتەكەی پێ دەسپێرێت.

٣ـ لە ریوایەتەكەی ئیمامی ئەحمەد (١٥٦/٤) دا كە شێخی ئەلبانی لە السلسة الصحیحة دا (٤٩٢) بە سەحیحی، داناوە: (مَنْ عَلَّقَ تَمِيمَةً فَقَدْ أشْرَكَ) نەك (مَنْ تَعَلَّقَ تَمِيمَةً) ..

٤ـ ئەو نوشتەیەی بە كەسێكەوە، یان بە ئاژەڵێكەوە هەڵدەواسرێ ، كە ئایەتی قورئان، یان دوعای پێغەمبەری خوای صلى الله علیه و سلم تێدا نوسـراوە ، ئـەوە هەنـدێك لـە زانایـان گوتویانـە جـائیزە ، لـەوانیش عائیشـەخان و عبداللـەی كـوڕی عـەمری كـوڕی عـاس و ئیمـامی ئیبنولقـەیمییش پەسـەندی كردوە... بەڵام باقی زانایانی تـر لەبـەر تـوخن نەكەوتنـەوەی موسـوڵمان لـە شـیرك، ڕێیـان لێگرتـوە ،

٣) له دەستکردنی دەستەوانەو موتفەرك: بە زۆری بۆ چاکبونەوەی نەخۆشی لە دەست دەکرێن وەك زەردویی و باداری و.. هتد، پێویستە موسوڵمان دەرمان بەکار بهێنێت بۆ نەخۆشی، چونکە فەرمایشتی شەرعی لەسەرە، نەك پەنا بباتە بەر شتی پڕو پوچ و بێ نرخ، حوزەیفە خوا لێی رازی بێت سەردانی نەخۆشێکی لە ماڵەوە کرد، بینی موتفەرکێکی لەدەست کردوە بۆ ئەوەی (تا)ی نەمێنێت، ئەمیش بچڕاندی و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾یوسف /١٠٦ واتە: زۆربەیان بە هاوبەش دانانەوە نەبێت ئیمان بە خوا ناهێنن. صحيح رواه ابن أبي حاتم[١].

٤) نوشتە کردن: ئەگەر نوشتە بریتی بێت لە بەکارهێنانی جۆرە وشەو دەستەواژەیەك، کە پاڕانەوە لە فریشتەو جنۆکەو پیاوچاکانی تێدا بێت، یاخود نهێنی حسابی و هەڵگێڕانەوەی ئایەت و ناوەکانی خوای گەورەی تێدا بێت، ئەوە هاوبەش دانانەو دروست نییە، چونکە عورف کوڕی مالیك خوا لێی رازی بێت دەڵێ: لە نەفامیدا نوشتەمان دەکرد، ئنجا کاتێك موسوڵمان بوین وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کارە چۆن دەبینیت ؟ فەرموی: (أعْرِضُوا عَلَي رُقَاكُمْ، لابأسَ بِالرُّقِي مَا لَمْ تَكُنْ شِرْكًا) رواه مسلم[٢] واتە: نوشتەکانتانم پیشان بدەن نوشتەیەك هاوبەش دانانی تێدا نەبێت قەیدی ناکات.

---

فەتوای شێخی ئەلبانی و بن بازو لیژنەی هەمیشەیی بانگەوازو فەتوای زانایانی حەرەمینیش رایان وایە (فتاوی اللجنة الدائمة ١ / ٢١٢).

١ ـ فتح المجيد شرح كتاب التوحيد – ١٦٢

٢ـ موسليم (١٩/٧)هەروەها: (أعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ , لَا بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فيهِ شِرْكٌ)سلسلة الاحاديث الصحيحة (٣ / ٥٥).

سیوتی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێ: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی، کە نوشتە کردن بەم سێ مەرجە دروستە:

١) بە ئایەتی قورئان، یاخود بە ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە بکرێت.
٢) بە زمانی عەرەبی و بە جۆرێك بێت واتاکەی ڕون بێت.
٣) ئەو کەسەی نوشتەکە دەکات ئیمانی وا بێت، کە خودی نوشتەکە کار ناکات بەڵکو ویستی خوا مەبەستەکەی دێنێتە جێ.

ب) **هاوبەش دانانی بچوکی شاراوە (الشرك الخفی):** بریتییە لە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە لە نیازو مەبەستەکاندا، وەك ئەوەی مرۆڤ کارێك یاخود قسەیەك بکات بۆ ڕوپامایی (الریاء)، یان بۆ ناوبانگ دەرکردن (السمعة) بکات . پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (الشِّرْكُ فِيكُمْ أخفَى مِنْ دَبيبِ النَّمْلِ )[1] واتە: هاوبەش دانان لە ناوتاندا لە خشپەی مێرولە شاراوەترە . هەروەها دەفەرموێت: (أخْوَفُ مَا أخَافُ عَلَيكُمْ الشِّرْكُ الأصغَرُ، قالُوا: يَا رسُولَ اللهِ وَمَا الشِّرْكُ الأصغَرُ ؟ قَالَ: الرِّيَاءُ)رواه احمد و الطبراني و البغوي[2] واتە: ترسناکترین شت، کە دەترسم بیکەن هاوبەش دانانی بچوکە، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا، هاوبەش دانانی بچوك چییە ؟ فەرموی: ڕوپاماییە.

---

١ ـ شێخی ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٣٦٢٥) دا بە سەحیحی داناوە...
٢ ـ ئیمامی ئەحمەد( ٥/٤٢٨، ٤٢٩)، بەیهیقی (٥/٣٣٣)، ئیمامی ئیبنوحەجەر دەڵێ: حەسەنە (٤/٣٥٥ـ سبل السلام) و شێخی ئەلبانی لە (صحیح الترغیب (٢٩) ) دا بە سەحیحی داناوە ..

## جۆرەکانی ڕوپامایی (ریـابازیی):

ئاشکرایە ڕوپامایی کـردن خـۆ گونجاندنـە لەگـەڵ واقیعـدا، یـاخود خـۆ پیشاندان بە واقیعێکی پەسەند تر لـەوەی کەسـی ڕیاباز لـە دەسـتی دێـت، بێگومـان لێـرەدا نـاخ و دڵـی مـرۆڤ نەخۆشـەو ڕوکـاری پـەردە پۆشـی ئـەو نەخۆشییە دەکەن، واتە: زمان و لاشەو پۆشاك و مامەڵەی مرۆڤـە، کـە لـە خزمەتی ئەوەدان، کە بیسەلمێنن کەسێکی ساڵحە، بەم پێیە ڕوپامـایی لـەم جۆرانەدا خۆی دەبینێتەوە:

١)ڕوپامایی بـە وتـە: وەك دەنـگ هـەڵبڕین و خۆپەشـۆکاندن و بەپەلـە قسە کردن و دەربڕینی تورەیی لە کاتی بینینی کاری خراپداو.. هتد.

٢) ڕوپامــایی بــە لاشــە: وەك پیشــان دانــی کــزی و لاوازی و زەرد هەڵگەڕاوی بەو نیازەی دەری بخات کە لە خوا ترسە.

٣) ڕوپامـایی بــە کـردەوە: وەك درێــژ کردنــەوەی نوێــژ، یـان سـامان بەخشین لە پێش چاوی خەڵك.

٤) ڕوپامایی بە پۆشاك: وەك پۆشینی جل و بەرگێکی تایبەتی و پیشان دانی شێوەی زانایەتی.

٥) ڕوپامایی بە هـۆی هاوەڵەوە: وەك حـەز کـردن بـە سـەردانی پیـاوی زاناو ناودار بۆ ماڵەوە، تـاکو خـەڵکی بڵێن: ئاسـتی بـەرزە، چـونکە پیـاوی گەورەدەناسێت وزانایان سەردانی دەکەن.

### خۆپاراستن لە هاوبەش دانان (الشرك):

هاوبـەش دانـان: بریتییـە لـەوەی مـرۆڤ شـتێك، یـان کەسـێك بکـات بـە هاوبەشی خوای گەورە لەو فرمانانەدا، کـە مـافی ڕەوای خـوان و کەسـی تـر شایستە نییە بۆی ئەنجام بدرێن، وەك دانانی پەرستراوی تر لەگـەڵ خـوادا بیپەرستێت، یان گوێرایەڵی بکات، یـان خۆشـی بوێـت، یـان داوای یارمـەتی لێ بکات و..هتد.

كەسێك ئاوا ڕەفتار بكات، هاوبەش دانانی گەورەی ئەنجام داوەو، هەر كردەوەیەكی چاكیشی هەبێت پوچەڵ دەبێتەوە، ڕەنگە خوا لە هەمو تاوانێكی خۆش ببێت، بەلاَم لە هاوبەش دانانەكەی خۆش نابێت، وەك دەفەرمویت: ﴿قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾الزمر/ ٦٥ واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێیت، كردەوەكانت پوچەڵ دەبنەوە . یاخود دەفەرمویت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴾النساء/١١٦ واتە: خوا لەوە خۆش نابێت، كە هاوبەشی بۆ دابنرێت، لە هەمو شتێكی تر خۆش دەبێت، ـ بێجگە لە هاوبەش دانان ـ بۆ هەر كەسێك خۆی بیەوێت.

جا ئەگەر هاوبەش دانان تاوانێكی هێندە سەخت و ستەمێكی هێندە گەورە بێت، كە دەرفەتی لێخۆشبونی نەبێت، وەك خوای گەورە لە زمانی لوقمانەوە بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴾لقمان/ ١٣ واتە: بەڕاستی هاوبەش دانان ستەمێكی گەورەیە، بێگومان بەهەشت یاساغە لە هاوبەش دانەرو دۆزەخ جێگەی هەمیشەییەتی، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴾ المائدة/ ٧٢ واتە: هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لێ یاساغ كردوەو شوێنی نیشتەجێبونی ئاگری دۆزەخەو ستەمكاران پشتیوانێكیان نییە . پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرمویت: (وَمَنْ لَقِيَ اللهَ يُشْرِكُ بِهِ شَيئاً دَخلَ النّارَ)رواه مسلم[١] واتە: هەر كەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خواو هیچ هاوبەشێكی بۆ دانابێت، دەچێتە ئاگرەوە.

---

١ـ بوخاری (١٢٩)موسلیم (٣٢).

# پایەی دووەم

# ئیمان هێنان بە فریشتەکان

**بەندی یەکەم: سیفاتی دروستکرانی فریشتە**

- باسی یەکەم: سیفاتی دروستکرانیان .
- باسی دوەم: سیفاتی ڕەوشت و ئاکاریان .
- باسی سێیەم: توانایان .
- باسی چوارەم: ئەرك و کردەوەیان .

**بەندی دوەم: پەیوەندی فریشتە بە مرۆڤەوە**

- باسی یەکەم: پەیوەندی فریشتە بە ئیماندارانەوە .
- باسی دوەم: پەیوەندی فریشتە بە بێباوەڕانەوە .
- پاشکۆ: کاریگەری ئیمانهێنان بە فریشتە لەسەر ژیانی مرۆڤ .

## پایەی دووەم: ئیمان هێنان بە فریشتەکان

فریشتەکان جیهانێکی نادیارن و خوای گەورە لە ڕوناکی (نور) دروستی کردون و هیچ تایبەتمەندییەکی پەرستراویەتییان نییە، بەڵکو خۆیان بەندەن و خواپەرستی دەکەن و پابەندی تەواویان بە فەرمانەکانی خواوە هەیەو توانای جێبەجێ کردنیان پێدراوەو چاکەکارن و، هەرگیز سەرپێچی ناکەن .

ئیمان هێنان بە فریشتەکانی خوا ئەم چوار خاڵەی خوارەوە دەگرێتەوە:

### یەکەم: باوەڕ هێنان بە بونی فریشتەکان.

پێویستە موسوڵمان بە دڵنیاییەوە بڕوای بە بونی فریشتەکان هەبێت، چونکە نکوڵی لێکردنیان، نکۆڵی کردنە لە پایەیەکی ئیمانو بە درۆخستنەوەی قورئان و فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، بەوەش بەندە لە بازنەی ئیمان دەچێتە دەرەوە، هەرچەندە فریشتەکان نادیارن و مرۆڤ ناتوانێت بە هۆی هەستەوەرەکانەوە پەی بە بونیان ببات، بەڵام لە ڕوانگەی چەندەها بەڵگەوە بۆی ساغ دەبێتەوە، کە بونیان سەلماوەو جیهانێکی واقیعین لەوانە:

١) بەڵگەی شەرعی: مەبەست لە بەڵگەی قورئان و فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾البقرة/ ٢٨٥ واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئیمانی هێناوە بەو پەیامەی بۆی ڕەوانە کراوە لە پەروەردگارییەوە، هەروەها

موسوڵمانانیش، هەموویان ئیمانیان هێناوە بە خواو بە فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوەکانی. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾النساء/١٣٦ واتە: هەرکەس ئیمانی نەبێت بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوەکانی و ڕۆژی دوایی، ئەوا گومڕا بوە گومڕاییەکی دور لە ڕێنماییەوە. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (الإيمان أنْ تؤمِنَ باللهِ وملائكَتِهِ وكُتبِهِ وَرُسُلِهِ واليومِ الاخِرِ وبالقَدَرِ خَيرِهِ وشَرِّهِ)رواه مسلم. واتە: ئیمان ئەوەیە بڕوات بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و نێرراوەکانی و ڕۆژی دوایی و بە خۆش و ناخۆشی قەزاو قەدەر هەبێت. هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا سەبارەت بە کاریگەری بەرچاوی فریشتە لەسەر مرۆڤ دەفەرموێت: (إنَّ لِلشَيطانِ لَمَّةً بِابنِ آدمَ، ولِلمَلَك لمَّةً، فأمَّا لَمَّةُ الشَيطانِ فإعادٌ بالشَرِّ، وَتكْذِيبٌ بالحَقِّ، وأمَّا لَمَّةُ المَلكِ فإعادٌ بالخَيرِ وتصديقٌ بالحَقِّ)رواه الترمذي و النسائي وابن حبان، وقال الترمذي: حسن غريب[1] واتە: شەیتان غایلە بە دڵی ئادەمیزاددا دێنێت و فریشتەش غایلە بە دڵیدا دێنێت، ئنجا غایلەی شەیتان ئەوەیە بەڵێنی شەڕی پێ دەدات و هانی دەدات ڕاستی بەدرۆ بخاتەوە، بەڵام غایلەی فریشتە ئەوەیە بەڵێنی خێری پێ دەدات و هانی دەدات بڕوا بەڕاستی بکات.. ئاشکرایە ئەم کاریگەرییەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باسی دەکات، هەمو کەسێك هەستی پێ دەکات و

---

١- ئەلبانی رەحمەتی دەربارەی گوتویەتی: (إسناده صحيح على شرط الشيخين) بڕوانە مشكاة المصابيح ل: ٧٠ فەرمودەکەش بە تەواوی ئاوایە: (إنَّ للشَّيطانِ لَمَّةً بابْنِ آدَمَ ، وللمَلَك لَمَّةً: فَأمَّا لَمَّةُ الشيطانِ ، فإيعادٌ بِالشَّرِّ ، وتكْذيبٌ بالحقِّ ، وأمَّا لَمَّةُ الملَك ، فإيعادٌ بالخيرِ ، وتصديقٌ بالحقِّ ، فَمَنْ وَجدَ ذلكَ ، فَلْيَعْلَم أنَّهُ مِن الله ، فَلْيَحْمِدِ اللهَ وَمَنْ وَجدَ الأُخْرَى ، فَلْيَتَعَوَّذْ بالله من الشيطانِ الرَّجيمِ ، ثُمَّ قَرَأ: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ﴾البقرة/٢٦٨) شێخ ئەحمەد شاکری رەحمەتیش دەربارەی گوتویەتی: (إسناده صحيح) بڕوانە: عمدة التفسير ١/٣٢٥).

بەڵگەیەکی بەرهەستە لەسەر بونی فریشتەکان.

ب) بەڵگەی ژیری: جیهانی نادیار زۆر شتی لە خۆیدا پەنهان کردوەو مرۆڤ بە هەستەوەرەکانی هەستیان پێ ناکات، بەڵام بە شوێنەواریاندا دەرك بە هەندێکیان دەکات و ئەمڕۆکە بونەتە بەڵگە نەویست، بۆ نمونە: شەپۆلی دەنگ، کە لەم سەردەمەدا لە ئێستگەکانەوە پەخش دەکرێت و بە ناوەندی شینەکانی هەوا (أثیر)دا تێدەپەڕێت نادیارەو هەستی پێ ناکرێت. لە ژورێکدا سەدان شەپۆلە دەنگ هەیەو هیچ هەستیشیان پێ ناکرێت، بەڵام بە هۆی ڕادیۆیەکەوە یەك یەکیان گوێ بیست دەبین، یاخود دڵۆپێك ئاوی پیس، کە لە ڕابوردودا تەنها تێبینی ئەوەی لێ دەکرا، کە تام و بۆن و ڕەنگی گۆڕاوەو هیچی تر بە هۆی وردبینەوە جیهانێکی زیندەوەری تێدا بەدی دەکرێت، هەروەها (وزەی کارەبا) و (گیان) و (هەوا) و.. هتد، هەمویان نادیارن، بەڵام بە شوێنەواریاندا بونەتە بەڵگەنەویست و هەمو کەس لە بونیان دڵنیایە . بەهەمان شێوە فریشتەکانیش جیهانێکی نادیارن و ڕاستەوخۆ هەستیان پێ ناکرێت، بەڵام شوێنەواریان دیارەو دەبێت بونیان بە لای موسوڵمانەوە بەڵگە نەویست بێت.

**دووەم: ئیمان هێنان بەو فریشتانەی کە بەناوی خۆیان ناویان دەزانین.**

وەك (جیبریل) (میکائیل) (ئیسرافیل) (مالیك: خەزنەداری دۆزەخ)و (مونکیرو نەکیر) (هاروت و ماروت) (مەلەکولمەوت) . هەروەها ئیمانهێنان بەسەرجەم ئەو فریشتانەی ناویان نازانین.

**سێیەم: ئیمان هێنان بەو فریشتانەی سیفەتەکانیان دەزانین:**

واتە ئیمان هێنان بە خۆیان و سیفەتەکانیان، کە سیفەتی فریشتەکان دەکرێت بە سێ بەشەوە:

## ـ باسی یەكەم: سیفەتی دروست كرانیان.

تـەنها ڕێگـەی زانـینی چۆنیەتی دروست كرانـی فریشـتەكان قورئـانی پیرۆزو سوننەتی ڕاستی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم، كە بـە ئەنـدازەی ئـەوەی ڕوانگەیـەكمان بۆیـان هـەبێت سـیفەتی دروسـت كرانیمـان بـۆ ڕون كراوەتەوە، لەوانە:

**١ـ پێش ئادەمیزادو لە ڕوناكی واتە (نور) دروست كراون:**

خـــــوای گــــــەورە دەفــــــەرموێت: ﴿إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ﴾سورەتی ص/٧١ واتە: كاتێك پـەروەردگارت بـە فریشـتەكانی فـەرمو: من مرۆڤێك لە قوڕ دروست دەكەم . مەبەست لەو مرۆڤە (ئـادەم )ە صـلی الله علیـە وسـلم كـە لـە پـێش ئـەودا فریشـتە هـەبوەو خـوای گـەورە ئـەو هەواڵەی پێ ڕاگەیانـدون . پێغەمبـەریش صـلی الله علیـە وسـلم دەربـارەی ئـەو ماددەیـەی، كـە فریشـتەی لـێ دروسـت كـراوە دەفـەرموێت: (خُلِقَـتِ الملائِكَةُ مِنْ نورٍ)رواه مسلم [١] واتە: فریشتەكان لە ڕوناكی دروست كراون.

**٢ـ شێوەیان:**

أـ گەورە و بەهێزن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ﴾ التحریم/٦واتە: دۆزەخ فریشتەی دڵ ڕەق و تورەوە بەهێزی بەسەرەوەیە.

پێغەمبــەریش صــلی الله علیــە وســلم دەربــارەی هــەڵگرانی عــەرش دەفـەرموێت: (أذِنَ لِي أحَـدِّثَ عَـنْ أحَـدِ حَمَلَـةِ العَـرْشِ، مَـابَيْن شَـحْمَةِ أذُنِـهِ

---

١ ـ موسلیم (٢٩٩٦).

وَعَاتِقِهِ مَسِيرَةَ سَبْعَمِائَةِ عَامٍ)رواه أبوداود وابن أبي حاتم، واسناده صحيح[۱] واته: ڕێگەم پێدراوە، کە باسی یەکێك لە هەڵگرانی عەرش بکەم، نێوانی نەرمایی گوێی و شانی بە ئەندازەی دوورایی حەوت سەد ساڵ ڕێگەیە .

ب ـ بە ژمارەی جیا جیا باڵیان هەیە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ فاطر/۱ واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوەو فریشتەکانی کردوە بە ڕەوانە کراو خاوەنی دو باڵ و سێ باڵ و چوار باڵن، لەوەش زیاتر دروست دەکات، ئەگەر ویستی بێت، بە ڕاستی خوا بەسەر هەمو شتێکدا توانایە..عبدالله کوڕی مەسعودیش خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: (رَأَى رَسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم جِبْرِيلَ فِي صُورَتِهِ وَ لَهُ سِتُمِائَةِ جَنَاحٍ، كُلُّ جَنَاحٍ مِنْهَا قَدْ سَدَّ الأُفُقِ)رواه أحمد، وقال ابن كثير في البداية: اسناده جيد[۲] واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جبریلی لە شێوەی خۆیدا بینیوە شەش سەد باڵی هەبوە، هەر باڵێکیشی ئاسۆی داگرتوە..

ج ـ جوانن: خوای گەورە دەربارەی جبریل علیه السلام دەفەرموێت: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ﴾ النجم/٥-٦ واتە: جبریلی زۆر بەهێز قورئانی فێری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کردوە، کە خاوەنی جوانییەو بە شێوەی ڕێکی خۆی دەرکەوت. ابن عباس خوا لێی ڕازی بێت (ذو مرة) بە ڕوخساری جوان ڕاڤە دەکات، هەروەها لە ناو خەڵکیشدا وا باوە، کە فریشتەکان شێوەیان جوانە، هەروەك ژنانی میسر بە (یوسف)

---

۱ـ شێخی ئەلبانی لە: صحيح الجامع الصغير (۸۵۳)دا بە سەحیحی ناساندوە .
۲ ـ بوخاری (۳۲۳۲، ۳۲۳۳)، موسلیم (۱۷٤ ، ۱۷۷).

پێغەمبەریان وت: ﴿حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾یوسف/٣١ واتە: حاشا بێت، کەم و کوڕی بۆ خوا نییە، ئەمە هەرگیز مرۆڤ نییە، ئەمە فریشتەیەکی بەڕێزەو هیچی تر.

د ـ پلەو پایەی جیا جیایان هەیە: خوای گەورە دەربارەی جبریل علیه السلام دەفەرموێت: ﴿ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ﴾ التکویر/٢٠ واتە: خاوەنی هێزەو لە لای خاوەن عەرش، کە خوای گەورەیە پلەو پایەی بەرزو بڵندی هەیە.

روفاعەی کوڕی رافع خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە جبریل هات بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (ما تعُدُّونَ مَنْ شَهِدَ بَدْراً فيكم ؟ قلتُ: خِيارُنا، قال: وكذلك مَنْ شَهِدَ بَدْراً مِنَ الملائكَةِ هُمْ عندنَا خِيارُ الملائكةِ)رواه البخاري[1] واتە: کەسێك لە ئێوە غەزای بەدری بینیبێت چۆنی دادەنێن ؟ وتم: چاکترین کەسمانە، فەرموی: هەروەها هەر فریشتەیەکیش لە ئێمە غەزای بەدری بینیبێت چاکترین فریشتەیە.

٣ ـ شێوازی ژیانیان:

أ ـ نێرو مێیان نییە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ....﴾ الزخرف/١٩ واتە: بێ ئیمانان ئەو فریشتانەی، کە بەندەی خوای گەورەن بە مێیان دادەنێن، ئایا ئامادەی دروست کرانیان بون؟ لێرەدا خوای گەورە نکوڵی لەو بۆچونەی بێ ئیمانان دەکات و بەر پەرچی دەداتەوە.

---

١ـ بوخاری (٣٩٩٢)ئیبنوماجە (١٦٠).

ب ـ ناخۆن و ناخۆنەوە: خوای گەورە باسی ئیبراهیم پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێك، کە فریشتەکان چونە ماڵی و دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴾ هود/٧٠ واتە: کاتێك بینی دەستیان درێژ ناکەن بۆ خواردنەکە، گومانی لێ پەیدا کردن و لێیان سڵەمییەوەو ترسا، وتیان: مەترسە، ئێمە نێراوین بۆ لای گەلی لوط واتە: فریشتەی سزا بون و خواردنیان نەخوارد.

ج ـ بێ تاقەت و ماندو نابن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴾الأنبياء/٢٠ واتە: شەو ڕۆژ پاك و بێگەردی بۆ خوا دەردەبڕن و سست نابن. یان دەفەرموێت: ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴾ فصلت/٣٨ واتە: شەو ڕۆژ پاك و بێگەردی بۆ خوا دەردەبڕن و بێ تاقەت نابن.

د ـ شوێن و جێگەیان ئاسمانە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴾فصلت/٣٨ واتە: ئەوانەی لە لای پەروەردگارتان پاك و بێگەردی بۆ خوا دەردەبڕن بە شەو ڕۆژو پەکیان ناکەوێت . مەبەست لە فریشتەکانە کە لە ئاسمانن .

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم جارێکیان لە ناو هاوەڵە بەڕێزەکانیدا بو، پێی فەرمون: ئایا ئەوەی من گوێ بیستی دەبم ئێوەش دەیبیستن ؟ وتیان: گوێمان لە هیچ شتێك نییە، فەرموی: (إنّي لأسْمَعُ أطِيطَ السَّمَاءِ، وَمَا تلامُ أنْ تئِطَ، وَمَا فِيها مَوضِعُ شِبْرٍ الْا و علَيهِ مَلَكٌ سَاجِدٌ

او قائِمٌ )[١] واتە: من گوێم لە نركەو ناڵەی ئاسمانە، لۆمەش ناكرێت ئەگەر بنركێنێت، جێگەی هەر بستێك و فریشتەیەكی لەسەرە، كڕنوشی بردوە، یان وەستاوەو نوێژ دەكات.

٤ـ ژمارەیان:

كەس ژمارەی فریشتەكان نازانێت، چونكە هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾المدثر/٣١ واتە: كەس ژمارەی سەربازەكانی پەروەردگارت نازانێت، تەنها خۆی نەبێت . پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەربارەی ماڵی ئاوەدان (بیت المعمور)، كە لە ئاسمانەو كەعبەی فریشتەكانە دەفەرموێت: (فإذا هو يَدخُلهُ في كُلِّ يَومٍ سَبعُونَ أَلفَ مَلَكٍ، لا يَعُودُونَ اليهِ اخِرُ ما عليهم)رواه البخاري و مسلم[٢] واتە: هەمو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی و كاتێك دوا بەیەكیان لێی دەردەچن هەرگیز ناگەڕێنەوە ناوی.

٥ـ مردنیان:

هەر وەك چۆن مرۆڤ و جنۆكە دەمرن بە هەمان شێوە فریشتەكانیش دەمرن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾الزمر/ ٦٨ واتە: فو دەكرێت بە كەڕەنا (صور)داو هەرچی لە ئاسمان و هەرچی لە زەویدایە دەمرن، مەگەر كەسێك خوا بیەوێت نەیمرێنێت. هەروەها دەفەرموێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ

١ ـ شێخی ئەلبانی لە (سلسلة الصحيحة ٨٥٢) دا دوای ئەوەی دەڵێ: تەبەرانی ریوایەتی كردوە، دەڵێ: (صحيح على شرط مسلم).
٢ ـ بوخاری (١٠٣/٦ ژ ٣٢٠٧)، موسلیم (١٤٦/١ ژ ١٦٢)ئەوەش لەفزی بوخارییە.

﴿إِلَّا وَجْهَهُ﴾ القصص/٨٨ واتە: هەمو شتێك تیا دەچێت تەنها ڕوی خوا نەبێت.

٢- سیفەتی ڕەوشت و ئاکاریان:

ا- خاوەنی ڕێزو چاکەن: خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿بِأَيْدِي سَفَرَةٍ ۝١٥ كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ عبس/ ١٥-١٦ واتە: قورئان بەدەستی باڵوێزانی خوادا، کە فریشتەکانن ڕەوانە دەکرێت، ئەوانەی بەڕێزو چاکەکارن .

ب- بە شەرمن: عائیشە خوا لێی رازی بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ماڵەوە ڕاکشابو، ڕانی یاخود لاقی بەدەرەوە بو، ئنجا ئەبوبەکر خوا لێی رازی بێت مۆڵەتی وەرگرت و هاتە ژورەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەر بەو شێوەیە بو، پاشان عومەر خوا لێی رازی بێت مۆڵەتی وەرگرت و هاتە ژورەوە، هەر بەو شێوەیە بو، ئنجا عوسمان خوا لێی رازی بێت هات و مۆڵەتی لێ وەرگرت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دانیشت و جلەکانی ڕێك کردو خۆی داپۆشی، عائیشە خوا لێی رازی بێت لەم بارەیەوە پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (ألَا أستحِيي مِنْ رَجُلٍ تستحِيي مِنهُ الملائِكَةُ)رواه مسلم[1] واتە: ئایا شەرم لە پیاوێك نەکەم، کە فریشتەکان شەرمی لێدەکەن .

٣- توانایان:

ا- دەتوانن خۆیان بگۆڕن: خوای گەورە توانای بە فریشتەکان داوە، کە شێوەی خۆیان بگۆڕن، هەروەك خوای گەورە دەربارەی جبریل علیە

---

١- موسلیم (٢٤٠٢ و ٤٤١٥) ئەحمەد(٢٥٢٥٧) شێخ شوعەیبی ئەرنائوت دەربارەی ئەم ریوایەتە دەفەرموێت (أسنادە صحیح علی شرط مسلم).

السلام، کە ناردی بۆ لای مریەم دەفەرموێت: ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾مريم/١٧ واتە: لە بەرچاویدا خۆی خستە شێوەی مرۆڤێکی ڕێك و تەواوەوە . هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت: (بَينَمَا نَحنُ جُلوسٌ عِندَ رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيه و سَلمَ، إذْ طَلَعَ عَلَينَا رَجُلٌ، شَدِيدُ بَياضِ الثِياب، شَديدُ سَوادِ الشَعْر، لا يُرَى عَلَيهِ أثرُ السَفَر، وَلا يَعْرِفُهُ مِنَا أحَدٌ ...) رواه مسلم[١] واتە: کاتێك ئێمە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دانیشتبوین، پیاوێکمان لێ دەرکەوت، جل و بەرگی زۆر سپی بو، موی زۆر ڕەش بو، شوێنەواری سەفەری پێوە نەدەبینرا، کەسیش لە ئێمە نەیدەناسی ، پاشان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی ڕاگەیاندین، کە ئەوە جبریل بو هات بۆ ئەوەی فەرمانی ئاینەکەتان فێر بکات.

ب - زۆر خێران: گەورەترین خێرایی، کە تا ئێستا مرۆڤ زانیبێتی خێرایی تیشکە، کە لە خولەکێکدا ١٨٦ هەزار میل دەبڕێت، بەڵام خێرایی فریشتەکان لەوەش زۆر زیاترە، کە بە پێوانەی مرۆڤ مەزندە ناکرێت، چونکە جاری وا هەبوە یەکێك پرسیاری لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کردوە، لە پرسیارەکەی نەبوەتەوە، دەستبەجێ جبریل (علیه السلام) لە لایەن پەروەردگارەوە وەڵامەکەی هێناوە.

ج - زانیارییان هەیە: فریشتەکان ڕاستەوخۆ زانیاری لە خوای گەورەوە فێر دەبن، واتە ناتوانن وەك مرۆڤ خۆیان هەوڵ بدەن و شت فێر ببن و زانیاری دەربارەی شتەکان پەیدا بکەن خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

---

١ - موسلیم(٨)، ترمزی(٢٦١٠)، ئیبنوماجە(٦٣)، ئیبنو خوزەیمە(٢٥٠٤) ئیمامی ئەحمەد (٣٦٧)..

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾البقرة/٣١-٣٢ واتە: ئادەم علیه السلام فێری هەمو ناوەكان بو، پاشان ئەو ناوانەی بە فریشتەكان ڕاگەیاند، خوای گەورە بە فریشتەكانی فەرمو: هەواڵم پێ بدەن بە ناوی ئەو شتانە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن ؟ وتیان: پاك و بێگەردی بۆ تۆیە، هیچ زانیارییەكمان نییە ئەوە نەبێت، كە تۆ فێرت كردوین، بەڕاستی هەر تۆ زاناو كاربەجێییت . بەڵام زانیارییەك، كە فریشتەكان تیایدا پسپۆڕن و مرۆڤ نییەتی نوسینی كردەوەكانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ﴾الإنفطار/١٠-١٢ واتە: ئێوە پارێزەرانتان بەسەرەوەیە، كە بەڕێزن و نوسەرن، ئەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن ئەوان دەیزانن

د ـ كاروباریان ڕێك و پێكە: بەو پێیەی كە فریشتەكان گوێ ڕایەڵی ڕەهایان بۆ خوا هەیەو حەزو ئارەزوی خۆیان تێكەڵ بە كارەكان ناكەن، بەڵكو چۆن فەرمانیان پێ بكرێت ڕێكاو ڕێك ئاوا ئەنجامی دەدەن، سەرجەم كاروباریان ڕێك و پێكە، بۆ نمونە: لە نوێژدا ڕێك و بەڕیز دەوەستن، وەك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانمان دەدات، كە چاویان لێ بكەین و دەفەرموێت: (ألا تصفُّونَ كَمَا تصُفُّ الملائِكَةِ عِنْدَ رَبِّهَا) واتە: ئایا ڕیز نابن هەروەك فریشتەكان لای پەروەردگاریان ڕیز دەبن ؟ وتیان: چۆن لای پەروەردگاریان ڕیز دەبن ؟ فەرموی: (يُكَمِّلُونَ الصَّفَّ الأوَّلِ فَالأوَّلِ، يَتَراصُّونَ فِي الصَّفّ)رواه الجماعة الا البخاري واتە: ڕیزی یەكەم تەواو دەكەن، ئنجا دوای ئەو، لە ڕیزدا ڕێك ڕادەوەستن. هەروەها

لە ڕۆژی دوایی دا ڕیز دەبەستن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾ الفجر/٢٢ واتە: لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارت دێت و فریشتەكان ڕیز ڕیز وەستاون. هەروەها لە پێشوازی و بەڕێ كردندا ڕەچاوییەك بە دواییەكی دەكەن و هەمان ڕێك و پێكییان تێدا بە دی دەكرێت، وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (آتي بابَ الجَنَّةِ فأستفتِحُ، فيَقُولُ الخازِنُ: مَنْ أنتَ ؟ فأقولُ: محمد، فيقولُ: بكَ أمِرْتُ ألا أفْتحَ لِأحَدٍ قبْلَكَ)رواه مسلم و أحمد[1] واتە: دێمە دەرگای بەهەشت و داوای كردنەوەی دەكەم، خەزنەداری بەهەشت دەفەرموێت: تۆ كێی ؟ منیش دەڵێم: محمد، دەفەرموێت: بۆ تۆ فەرمانم پێكراوە، نابێت پێش تۆ بۆ هیچ كەسی بكەمەوە.

٤ ـ ئیمانهێنان بەو كردەوە تایبەتی و گشتی یانەی بە فەرمانی خوای گەورە ئەنجامیان دەدەن: كە دەكرێن بە دو بەشەوە:

١- ئەو كردەوانەی بەرامبەر خوای گەورە ئەنجامیان دەدەن: فریشتەكان بە تێكڕا كاریان خوا پەرستی و گوێ ڕایەڵییەو، بەبێ هیچ ئەرك و ماندو بونێك ئەنجامی دەدەن و باشترین وەسفیان ئەوەیە (بەندەی خوان)، بۆ نمونە:

أ - نوێژ دەكەن: وەك لە فەرمودەكەی پێشودا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (ألا تصفُّونَ كمَا تصُفُّ الملائكةِ عِندَ رَبِّهَا)[2] واتە: ئایا ڕیز نابن وەك چۆن فریشتەكان لای پەروەردگاریان ڕیز دەوەستن؟

---

١ ـ موسلیم(١٩٧)، ئیمامی ئەحمەد (٣/١٣٦ ژمارە ١١٩٨٩).
٢ ـ موسلیم(٤٣٠) ئەبوداود (٦٦١)، نەسائی (٨١٦)، ئیمامی ئەحمەد (٢/٩٧ ژمارە ٥٧٢٤) .

ب- یادی خوا دەکەن و پاك و بێگەردی بۆ دەردەبڕن: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾النحل/٥٠ واتە: لە پەروەردگاریان دەترسن، کە لە سەروویانەوەیە و ئەوەی فەرمانیان پێ بکرێت ئەنجامی دەدەن، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەربارەی (جیبریل) علیه السلام، کە چۆن لە خوای گەورە دەترسێت، فەرمویەتی (مَرَرْتُ ليلةَ أُسْرِيَ بي بالملأ الأعلى، وَجِبْرِيلُ كَالحِلْسِ البَالي مِن خَشْيةِ الله تعالى )[١] واتە: ئەو شەوەی کە شەوڕەوییم پێ کرا بە کۆڕە بەرزەکانی فریشتەدا تێپەڕیم، بینیم جیبریل لە ترسی خوای گەورە وەك سەرکورتانی کۆنی لێهاتوە.

٢-ئەو کردەوانەی لە ژیانی مرۆڤ و بونەوەردا ئەنجامی دەدەن: پەیوەندی فریشتەکان بە بونەوەرو مرۆڤەوە، بەشێکە لەو خوا پەرستییەی پێی هەڵدەستن، چونکە هەر بە فەرمانی خوای گەورە هەڵدەستن بە مشور خواردنی کاروباری بونەوەرو چاودێری ژیان و بێ گیان و یاساو ڕێسای بەڕێوە چونیان دەکەن و سپێرراون بە پاراستنی ڕۆژو مانگ و زەوی و سەرجەم ئاسمانەکان و هەورو باران و ڕوەك و جیاو ڕوبارو ژیان و مردن و بەندەکان و گیانەوەران و ڕوداوەکان و .. هتد، وەك خوای گەورە لە وەسفیاندا دەفەرموێت: ﴿فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا﴾النازعات/٥ واتە: سوێند بەو فریشتانەی مشوری کاروبار دەخۆن. یان دەفەرموێت: ﴿فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا﴾النازعات/٤ واتە: سوێند بەو فریشتانەی پێشبڕکێ دەکەن لە جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوا. ئنجا لە قورئان و فەرمودەدا

---

١ـ شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە (الصحيح الجامع ژمارە ٢٠٦/٥) دا دەڵێ: تەبەرانی ریوایەتی کردوەو حەسەنە.

کردەوەی تایبەتی هەندێکیان ئاماژەی پێکراوە لەوانە:

ا - جبریل نێرراوی سروش (وەحی)ە.

ب - ئیسرافیل فو بەکەڕەنا (صُور)دا دەکات.

ج - میکائیل باران دەبارێنێت.

د - (مَلَكُ المَوت) واتە فریشتەی مەرگ، گیانی بەندەکانی دەکێشێت .

ه - مالك: خەزنەداری دۆزەخە.

و- ئەو فریشتانەی بە چاودێریکردنی کۆرپەلە سپێرراون، کە لە پـزدان (رەحم)ی دایکدایە.

ح - ئەو فریشتانەی سـپێرراون بـە پرسـیار کـردن لـە مـردو، کاتێـك لـە گۆڕ دەنـرێت.

## بەندی دوەم: پەیوەندی فریشتەکان بە مرۆڤەوە

### باسی یەکەم: پەیوەندی فریشتە بە موسوڵمانەوە

فریشتەو موسوڵمان هاودەنگ و هاوڕێبـازی یـەکن، چـونکە هـەردوکیان ملکـەچ و گـوێ ڕایـەڵی فەرمانـەکانی خـوای گـەورەن، جـا هـەر بـەم ڕوانگەیەش فریشتەکان پەیوەندی، یان بە موسوڵمانانەوە هەیەو مامەڵەی لەگەڵ دەکەن.

لـەو هەڵوێسـتانەی، کـە فریشـتەکان هەیانـە بەرامبـەر موسـوڵمان ئەمانەن:

١) خۆشیان دەوێت: پێغەمبەر صلی الله علیـه وسـلم دەفـەرموێت: (إنَّ اللهَ تبَارَكَ وَتعالی اذا أحَبَّ عَبْدَاً نَادَى جبْرِيلَ: إنَّ اللهَ قَدْ أحَبَّ فُلانَاً فأحِبـهُ، فيُحِبُّهُ جبْريلُ، ثمَّ يُنَادي جبريلُ فِي السَّماء: إنَّ اللهَ قَدْ أحَـبَّ فُلانـَا فـأحِبُوهُ،

فَيُحِبُّهُ أهلُ السَّمَاءِ، وَيُوضَعُ لَهُ القَبُولُ فِي الأرضِ)رواه البخاري ومسلم[١] واتە: ئەگەر خوای بەرزو بێ هاوتا بەندەیەکی خۆش ویست بانگی جوبریل دەکات و پێی دەفەرموێت: ئەوا خوای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بوێت، جبریلیش خۆشی دەوێت، پاشان جبریل بانگی ئاسمانییەکان دەکات و دەفەرموێت: ئەوا خوای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت، ئاسمانییەکانیش خۆشیان دەوێت، ئنجا ڕازی بون و خۆشەویستی ئەو کەسە دەکەوێتە ناو خەڵکی سەر زەویشەوە.

٢) ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدەن: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ سَألَ القَضَاءَ والى نَفْسَهُ، وَمَنْ أجْبَرَ عليهِ يَنزِلُ اللهُ عَلَيهِ مَلَكًا فيُسَدِّدهُ)رواه الترمذي وابن ماجة[٢] واتە: هەرکەس داوای دادوەریەتی بکات دەسپێررێت بە خۆی، هەرکەس ناچار بکرێت لەسەری، کە بیکات خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت و ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدات و هەنگاوەکانی بۆ ڕاست دەکاتەوە).

٣) داوای لێخۆش بونی بۆ دەکەن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾الشورى/٥ واتە: فریشتەکان بە ستایشی پەروەردگاریان پاك و بێگەردی بۆ دەردەبڕن و داوای لێخۆش بون بۆ ئەو کەسانە دەکەن، کە لەسەر زەویدان. هەروەها دەربارەی هەڵگرانی عەرش و ئەوانەی بە دەورییەوەن دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ

---

١ ـ بوخاري (٣٢٠٩) ، موسليم (٢٦٣٧).

٢ ـ شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە سلسلة الاحاديث الضعيفة (٣/ ٢٩٦)و (ضعيف سنن ابن ماجة (٢٣٠٩)، و ضعيف الجامع الصغير (٥٦١٤)دا دەڵێ زەعیفە .

ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾الغافر/٧-٩

**واتە: ئەوانەی عەرشیان هەلگرتوە و هەرچی بەدەورییەوەیە، بە ستایشی پەروەردگاریان پاك و بێگەردی بۆ دەردەبڕن و ئیمانی پێ دێنن، و داوای لێخۆش بون بۆ ئەوانە دەکەن، کە ئیمانیان هێناوەو دەڵێن: پەروەردگارمان بەبەزەیی و زانستی خۆت هەمو شتێك داگرتوە، جا لەوانەش خۆش ببە، کە تەوبەیان کردوەو شوێنی ڕێبازەکەت کەوتون و لە سزای دۆزەخ بیان پارێزە، پەروەردگارمان بیانخەنەرە ئەو بەهەشتە ئامادە کراوانەوە، کەوا بەڵێنت پێ داون و ئەوانەش کەوا چاك بون لە باو باپیران و هاوسەران و وە چەکانیان، بەڕاستی هەر تۆی شکۆمەندو کار بەجێ ی، لە ناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی بیان پارێزە، چونکە هەرکەس لەو ڕۆژەدا لە ناخۆشییەکان چەپاڵە بدرێت ئەوا ڕەحمت پێ کردوە، هەر ئەوەشە بردنەوەو سەرفرازی گەورەو مەزن.**

**٤) درودی بۆ دەنێرن: خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ **الأحزاب/٤٣ واتە: ئەو خوایەیە، کە ڕەحمەتی خۆیتان بەسەردا دەبارێنێت، فریشتەکانیش داواو تکاتان بۆ دەکەن، تا لە تاریکییەکان دەرتان بێنێت بۆ ڕوناکی، خوای گەورە بەرامبەر موسوڵمانان میهرەبان و بەبەزەییە.. ئەو کردەوانەش کە بە هۆیانەوە فریشتەکان درود دەنێرن زۆرن، لەوانە: ئەوکەسەی خەڵکی فێری چاکە بکات، ئەوەی دێت بۆ**

مزگەوت بە مەبەستی نوێژ کردن، ئەوەی لە ڕیزی یەکەمدا نوێژ بکات، ئەوەی لە جێگەی نوێژکردنەکەیدا دەمێنێتەوە، ئەوانەی بەڕیز نوێژ دەکەن و کەلێنەکان پڕدەکەنەوە، ئەوەی درود بۆ سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بنێرێت، ئەوەی سەردانی نەخۆش بکات .

٥) ئامادەی کۆڕی زیکرو زانستی دەبن: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ الَّا نَزَلَتْ عَلَيهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الملائِكَةُ، وَذَكَرَهُمْ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)رواه مسلم[١] واتە: هەر کۆمەڵێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆ ببنەوەو کتێبەکەی خوا بخوێننەوەو لە نێوانی خۆیاندا موتالای بکەن، ئارامی و دڵنیایی بەسەریاندا دەڕژێت و، بەزەیی و ڕەحمەت دایان دەپۆشێت و، فریشتەکان چواردەورەیان دەدەن، خوای گەورە لای ئەوانەی لە خزمەتی خۆیدان باسیان دەکات.

٦) مژدەو مزگێنی خۆشی پێ دەدەن: فریشتەکان مژدەیان دا بە ئیبراهیم عليه السلام، کەوا خوای گەورە وەچەیەکی (صالح)ی پێدەدات، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿...وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ﴾الذاريات/٢٨ واتە: مژدەیان پێ دا بە منداڵێکی زۆر لێزان و زانا، هەروەها مژدەیان دابە زەکەریا عليه السلام کە یەحیای پێ دەدرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ ﴾ال عمران/٣٩ واتە: فریشتەکان بانگیان کرد، لەو کاتەدا، کە لە

---

١ ـ موسلیم (٢٦٩٩ و ٢٧٠٠)، سونەنی ئەبوداود (١/٤٦٠ ژمارە ١٤٥٥)شێخی ئەلبانیش لە (الجامع الصغیر وزیادته ١/١٠٤٥ ژمارە ١٠٤٤٦) دا بە سەحیحی داناوە، فەرمودەی تریش هەر لە سەحیحی موسلیمدا لەم بارەوە هەیە ، بڕوانە شەرحی ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی لەسەر سەحیحی موسلیم / ١٨٩/١٧).

میحرابەکەدا وەستابو نوێژی دەکرد، کەوا خوا مژدەت دەداتێ بە یەحیا.. وە نەبێت ئەم مژدە پێدانە هەر تەنها بۆ پێغەمبەران بێت (علیهم السلام)، بەڵکو بۆ موسوڵمانانی تریشە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (زارَ رَجُلٌ أخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أخرى، فأرصَدَ اللهُ لَهُ عَلَى مَدرَجِهِ مَلَكاً، فلمَّا أتى عليهِ، قالَ: أينَ تريدُ ؟ قالَ: أريدُ أخاً لِي فِي هذهِ القَريَهِ، قالَ: هلْ لكَ عليهِ مِنْ نِعمَةٍ ترُبُّهَا ؟ قالَ: لا، غيرَ أنّي أحبَبتُهُ فِي اللهِ عزّوَجَلَّ، قالَ: فإنّي رَسُولُ اللهِ اليكَ بأنَّ اللهَ قدْ أحبَّكَ كمَا أحبَبتَهُ فيهِ)رواه مسلم[1] واتە: پیاوێك سەردانی برایەکی خۆی دەکرد لە دێ یەکی تر، خوای گەورەش فریشتەیەکی ناردە ڕێگەکەی، کاتێك پێی گەیشت فریشتەکە وتی: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: دەمەوێت بچم بۆ لای برایەکم لەم دێیە، وتی: ئایا هیچ چاکەیەکت بەسەرەوە هەیە تاکو چاودێری بکەیت و بەسەری بکەیتەوە ؟ وتی: نەخێر، ئەوەندە نەبێت من لەبەر خوای گەورە خۆشم ویستوە، وتی: من ڕەوانە کراوی خوام بۆ لای تۆ، کە مژدەت بدەمێ بەوەی خوا خۆشی دەوێیت هەر وەك تۆ براکەتت لەبەر خوا خۆشویستوە.

٧) لە کاتی تەنگانەو جەنگدا دێن بە هانایەوەو پشتیوانی لێ دەکەن و سەری دەخەن: هەر وەك لە جەنگی (بەدر)دا بەشداریان کردو موسوڵمانەکانیان سەرخست، خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾الأنفال/٩ واتە: کاتێك داوای فریاکەوتنتان لە پەروەردگارتان دەکرد، ئەویش بە هاناتانەوە هات و فەرموی: من پشتیوانیان لێ دەکەم

---

١ ـ موسلیم (٢٥٧٦).

بەهەزار فریشتەی یەك لە دواییەك و پێشڕەو. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ڕۆژی (بەدر) دەیفەرمو: (هذا جبريلُ آخِذٌ برأسِ فرَسِهِ، عليهِ أداةُ الحربِ)رواه البخاري[1] واتە: ئەوە جبریلە سەری ئەسپەکەی گرتوەو پێویستی شەڕی بەسەرەوەیە.

٨) لەگەڵ تەرمەکەیدا ئامادە دەبن: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی (سەعدی کوڕی مەعاز خوا لێی ڕازی بێت فەرموی: (هذا الذي تحرَّكَ لهُ العَرشُ، وفُتِحَت لهُ أبوابُ السَّمَاءِ . وَشهِدَهُ سَبعُونَ ألفاً مِنَ الملائِكَةِ، لَقَدْ ضَمَّ ضَمَّةً، ثمَّ فُرِجَ عَنهُ )[2] واتە: ئەم هاوەڵەی، کە عەرش بۆی لەرزی و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوەو حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی بە گۆڕ سپاردنی بون، گوشینێك گوشرا، پاشان دەروی لێ کرایەوە.

## باسی دووەم: پەیوەندی فریشتەکان بەبێ ئیمانەوە

بەو پێودانگەی کە فریشتەکان گوێ ڕایەڵی خوای گەورەن و بێ ئیمان یاخی و سەرکەشەو سەرپێچی فرمانی خوا دەکات، بێگومان خۆشییان لێ نایەت و هەڵوێستیان توندە بەرامبەر بەوەی:

١- بە فرمانی خوای گەورە سزای دەدەن: هەر وەك ئەو فریشتانەی بونە میوانی ئیبراهیم پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێیان فەرمو: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمٖ مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرۡسِلَ عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن طِينٖ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُسۡرِفِينَ ﴾الذاريات/ ٣٢-٣٤ واتە: ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ لای کۆمەڵی تاوانباران کە گەلی (لوط) بو بۆ ئەوەی کلۆ بەردیان بەسەردا ببارێنین،

---

١ـ بوخاری (٣١٢/٧ ژ ٣٩٩٥).

٢ـ رواه النسائي باسناد صحيح وهو في (صحيح الجامع) ٧٢/٦ .

کە لە قوڕ پێکهاتوە، لە لایەن پەروەردگارتەوە نیشانە کراون بۆ ئەوانەی کە سەرکەشن.

٣- نەفرینی لێ دەکەن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾البقرة/ ١٦١ واتە: ئەوانەی بێ ئیمانن و بە بێ ئیمانیش دەمرن، نەفرینی خواو فریشتەکان و هەمو خەڵکی یان لێ دەکرێت.

**ئەو کارانەی فریشتەکان بەکردنیان نەفرین لە خاوەنەکەی دەکەن**

ئەو کارانەی شایستەن، کە فریشتەکان لەسەریان نەفرین لە ئەنجامدەرەکەیان بکەن زۆرن، لەوانە: ئافرەتێك نەچێت بەدەم مێردەکەیەوە، ئەو کەسەی ئاسنێکی تیژ لە براکەی بەرز بکاتەوە، ئەو کەسەی جنێو بە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بدات، ئەو کەسەی رێگر بێت لەبەردەم جێ بەجێ کردنی شەرعی خوادا، ئەو کەسەی داڵدەی بیدعە چییەك بدات.

## باسی سێیەم: کاریگەری ئیمانهێنان بە فریشتەکان لەسەر ژیانی مرۆڤ

یەکەم: پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی لە مێشکی مرۆڤدایەو بە ئیمان بە نادیار پڕ دەبێتەوە، بەهۆی ئیمان بە فریشتەکانەوەو دورکەوتنەوە لە ئەفسانەو شتی پروپوچ.

دووەم: شارەزا بون لە گەورەیی دەسەڵاتی خوای گەورە، چونکە کاتێك موسوڵمان تێ دەگات، کە جیهانێکی هێندە بێگەردو بە مشورو فراوان هەیە، ئەویش جیهانی فریشتەکانە، حەتمەن زیاتر بە توانایی و مەزنیەتی خوای بۆ دەردەکەوێت.

سێیەم: سوپاسگوزار کردنی خوای گەورە لەسەر ئەوەی ئەوەندە گرنگی بە ژیانی داوەو ئەو هەموو فریشتانەی ڕاسپاردوە، کە کاروباری ژیانی بەرێوە ببەن.

چوارەم: خۆشویستنی فریشتەکان، چونکە کەسێك ئیمانی وابێت، کە ئەو فریشتانە هێندە بە تەنگییەوەن و خۆشیان دەوێت و نزای خێری بۆ دەکەن. بێگومان ئەمیش خۆشی دەوێن و دەیانکاتە هاودەنگ و دڵنەوای خۆی.

پێنجەم: دور کەوتنەوە لە خراپەو تاوان و دامەزراوی لەسەر ڕێبازی خوا، چونکە کەسێك بزانێت چاودێر سەرپەرشتیاری هێندە کارامەو و ردەکاری بەسەرمیەوە، کە وتەو کردەوەو خایلەشی تۆمار دەکەن و لەسەری دەکەن بە ماڵ حەتمەن لە خۆی بە ئاگا دەبێت و پارێزگاری چاکی کردەوەکانی دەکات.

شەشەم: دور کەوتنەوە لەو شتانەی، کە فریشتەکان پێیان ناخۆشە، وەك: خواردنی سیرو پیاز، چونکە لە کاتی چونە مزگەوتدا فریشتەکان پێی سەغڵەت دەبن، هەروەها تف کردن بەلای ڕاستدا، لەکاتی هەڵسان بۆ نوێژ، چونکە فریشتەیەك لەلای ڕاستی مرۆڤەوەیە .

# پایەی سێیەم

# ئیمان هێنان بە کتێبەکانی خوای گەورە

**بەندی یەکەم: باسەکانی ئیمان هێنان بە کتێبە ئاسمانیەکان**

- باسی یەکەم: کتێبەکان لە لایەن خوای گەورەوە نێرراون.
- باسی دوەم: زانراوانی ئەو کتێبانە.
- باسی سێیەم: ڕاستی هەواڵەکانیان .
- باسی چوارەم: پێوەپابەندبونیان .
- باسی پێنجەم: قورئان کۆتا کتێبی خواییە..

**بەندی دووەم:قورئان و لایەنەکانی ئیعجازی**

- باسی یەکەم: نمونەیەك لە ئیعجازی مێژویی .
- باسی دووەم: نمونەیەك لە ئیعجازی رەوانبێژیی.
- باسی سێیەم: نمونەیەك لە ئیعجازی زانستی .
- پاشکۆ: کاریگەریی.

## پایەی سێ یەم: ئیمان هێنان بە كتێبەكانی خوا

كتێبەكانی خوا: مەبەست لەو كتێبانەیە، كە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردون. بۆ ئەوەی ببنە مایەی رێنمایی و رۆشنایی بۆ خەڵكی و بەهۆیانەوە بەختەوەری و كامەرانی دنیاو دوا رۆژ بەدەست بێنن، ئیمان هێنان بەكتێبەكانی خوای گەورە ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

### باسی یەكەم: ئیمانهێنان بەوەی رەوانەكرانیان بەراستی لەلایەن خواوەیە و مایەی رێنمایی و بەختەوەرین بۆ بەندەكان، بە بەڵگەی.

ا ـ شەرعی: چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ﴾الحديد/٢٥ واتە: پێغەمبەرانمان بە ئایەت و بەڵگەی ئاشكراوە رەوانە كردوەو، كتێب و تەرازومان لەگەڵدا ناردون، بۆ ئەوەی خەڵكی بە دادگەرانە هەڵس و كەوت بكەن.

ب ـ ژیریی: ئاشكرایە حیكمەتی دروستكرانی بەندەكان لەلایەن خوای گەورەوە بە روانگەی قورئان بریتییە لە بەندایەتی و پەرستنی خوا، بێگومان خواپەرستیش لەبەر رۆشنایی پەیام و رێنمایی و رێساوە نەبێت وەك پێویست ئەنجام نادرێت، ئنجا كاتێك خوای گەورە فەرمانی خواپەرستنی بە بەندەكان سپاردوە، حەتمەن رێ و شوێنی بۆ داناون و پێی راگەیاندون، كە چۆن بەندایەتی بكەن و پابەندو ملكەچی فەرمانەكانی بن، ئەوەش لە رێگەی ئەو كتێبانەوە، كە رەوانەی كردون.

## باسی دووەم: ئیمان هێنان بەو کتێبانەی کە بەناوی خۆیان ناویان دەزانین.

هەروەها ئەوانەش، کە ناویان نازانین، ئنجا ئەو کتێبانەی، کە ناویان دەزانین ئەمانەن:

١) سوحوف (الصُحُف)کە بۆ سەیدنا ئیبراهیم و سەیدنا موسا سەلامی خوایان لێ بێت ڕەوانە کراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ﴾الأعلى/١٧-١٩ واتە: دوارۆژ باشترو نەبڕاوەترە، ئەمە لە پەیامی سوحوفەکانی پێشودا هاتوە، سوحوفی ئیبراهیم و موسا .

٢) تەورات (التوراة)کە بۆ سەیدنا موسا هاتوە سەلامی خوای لێ بێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾المائدة/٤٤ واتە: ئێمە تەوراتمان ناردوەتە خوارەوە، کە ڕێنمایی و ڕوناکی تێدا بو.

٣) زەبور (الزبور)، کە بۆ سەیدنا داود هاتوە سەلامی خوای لێ بێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا﴾الإسراء/٥٥ واتە: زەبوریشمان بۆ داود ڕەوانەکرد .

٤) ئینجیل (الانجیل)کە بۆ سەیدنا عیسا هاتوە، سەلامی خوای لێ بێت. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾المائدة/٤٦ واتە: عیسای کوڕی مریەممان بە شوێن ئەو پێغەمبەرانەدا ڕەوانە کرد، کە بڕوای بەو تەوراتە هەبو لە پێش خۆیەوە ڕەوانەکرابو، ئینجیلمان بۆ نارد، کە ڕێنمایی و ڕوناکی تێدا بو.

٥) قورئـان (القـرآن)کـه بـۆ محمـد صـلی الله علیـه وسـلم ڕەوانـه کـراوە. خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: (وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا )الإسراء/١٠٦ واتە: قورئانمان بە جیا جیا ناردوەتە خوارەوە بۆ ئەوەی بەهێواشی و لەسـەرخۆ بـۆ خـەڵکی بخوێنێتـەوەو بـە پێـی کـات و شـوێنی پێویست ناردومانە خوارەوە.

## باسی سێ یەم: بڕوا کردن بەو هەواڵانەی پێمان ڕادەگەیەنن و ڕاستن:

وەك ئـەو هـەواڵ و باسـانەی، کـە لـە قورئانـدا، یـاخود لـە کتێبـە پێشوەکاندان و گۆڕان و شێواندنیان بەسەردا نەهاتوە، بە نمونـە: (أبـو ذر) خوا لێی ڕازی بێت، دەربارەی (صحف)ی سەیدنا ئیبراهیم و سەیدنا موسـا سەلامی خوایـان لـێ بێـت دو نمونـەمان لـە پێغەمبـەرەوە (صـلی الله علیـه وسـلم) بـۆ دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: کـە لـە پێغەمبـەری خـوام صـلی الله علیـه وسلم پرسی: (قُلتُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا كَانَـتْ صُحُفُ إِبْـرَاهِيمَ ؟ قَـالَ: كَانَـتْ أَمْثَالًا كُلُّهَا: أَيُّهَا المَلِكُ المُتَسَلِّطُ المُبْتَلَى المَغْرُورُ، إِنِّي لَمْ أَبْعَثْكَ لِتَجْمَعَ الدُّنْيَا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلَكِنْ بَعَثْتُكَ لِتَرُدَّ عَنِّي دَعْوَةَ المَظْلُومِ. فَإِنِّي لَا أَرُدُّهَا وَلَوْ كَانَتْ مِنْ فَمِ كَافِرٍ. وَكَانَ فِيهَا أَمْثَالٌ: وَعَلَى العَاقِلِ أَنْ يَكُونَ لَهُ ثَلَاثُ سَاعَاتٍ: سَاعَةٌ يُنَاجِي فِيهَا رَبَّهُ، وَسَاعَةٌ يُحَاسِبُ فِيهَا نَفْسَهُ، يُفَكِّرُ فِيهَا فِي صُنْعِ اللهِ - عَزَّ وَجَلَّ - إِلَيْهِ، وَسَاعَةٌ يَخْلُو فِيهَا لِحَاجَتِهِ مِنَ المَطْعَـمِ وَالمَشْـرَبِ . وَعَلَـى العَاقِلِ أَلَّا يَكُونَ ظَاعِنًا إِلَّا فِي ثَلَاثٍ: تَـزَوُّدٍ لِمَعَـادٍ، وَمَرَمَّـةٍ لِمَعَـاشٍ، وَلَـذَّةٍ فِـي غَيْرِ مُحَرَّمٍ. وَعَلَى العَاقِلِ أَنْ يَكُونَ بَصِيرًا بِزَمَانِهِ، مُقْبِلًا عَلَـى شَأْنِهِ، حَافِظًـا لِلِسَانِهِ. وَمَنْ عَدَّ كَلَامَهُ مِنْ عَمَلِهِ قَلَّ كَلَامُـهُ إِلَّـا فِيمَـا يَعْنِيـهِ . قَـالَ: قُلْـتُ يَـا رَسُولَ اللهِ، فَمَا كَانَتْ صُحُفُ مُوسَى؟ قَالَ: كَانَـتْ عِبَرًا كُلُّهَا: عَجِبْتُ لِمَنْ أَيْقَنَ بِالمَوْتِ كَيْفَ يَفْـرَحُ ! وَعَجِبْتُ لِمَنْ أَيْقَنَ بِالقَدَرِ كَيْـفَ يَنْصَـبُ. وَعَجِبْـتُ لِمَـنْ

رَأى الدُّنيَا وَتقَلُّبَهَا بأهْلِهَا كَيفَ يَطمَئِنُّ إِليهَا ! وَعَجِبتُ لِمَنْ أيقَنَ بالحِسَابِ غَدًا ثمَّ هُوَ لَا يَعمَلُ!. قَالَ: قُلتُ يَا رَسُولَ اللّهِ، فَهَلْ فِي أيدِينَا شَيْءٌ مِمَّا كَانَ فِي يَدَيْ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى، مِمَّا أنزَلَ اللّهُ عَلَيكَ ؟ قَالَ: " نَعَم اقرَأ يَا أبَا ذَرّ: قَدْ أفلَحَ مَنْ تزَكَّى وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى بَلْ تؤْثِرُونَ الحَيَاةَ الدُّنيَا وَالآخِرَةُ خَيرٌ وَأبقَى إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الأولَى صُحُفِ إبرَاهِيمَ وَمُوسَى ...)[1] واتە: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (صحف)ی (ابراهیم) چۆن بوە؟ فەرموی: هەموی پەند بوە، بۆ نمونە تێیدا هاتوە: ئەی پاشای زاڵمی تاقیکراوەی لە خۆبایی، من نەم ناردویت دنیا بەسەریەکدا کۆبکەیتەوە، بەڵکو ڕەوانەم کردویت بۆ ئەوەی نزای ستەم لێکراوم لێڕەت بکەیتەوە ! چونکە من ڕەتی ناکەمەوە، ئەگەر چی لە بێ ئیمانیشەوە بێت. پێویستە کەسی ژیر ئەگەر لە ژیرییەتی نەکەوتبێ چەند ساتێکی هەبێت: ساتێك تێیدا لە خوا بپاڕێتەوەو ساتێك لێپرسینەوە لەگەڵ دەرونی خۆیدا بکات و ساتێك بیر لە دروست کراوەکانی خوای گەورە بکاتەوەو ساتێك بۆ پێویستی خواردن و خواردنەوەی یەکلا ببێتەوە.. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوحوفی موسا سەلامی خوای لێ بێت چۆن بوە ؟ فەرموی: هەموی ئامۆژگاری بوە، بۆ نمونە تێیدا هاتوە: سەرم لە کەسێك سوڕ ماوە، کە لە مردن دڵنیایە و دڵخۆشە! سەرم لە کەسێك سوڕ ماوە، کە لە ئاگری دۆزەخ دڵنیایە و پێ دەکەنێت، سەرم لە کەسێك سوڕ ماوە، کە لە قەزاو قەدەر دڵنیایەو خۆی ماندو دەکات ! سەرم لە کەسێك سوڕ ماوە، کە دەبینێ چۆن دنیا ئاڵ و گۆڕ بە خەڵکی دەکات، پاشان دڵی پێ خۆش

---

١ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە، کە (رواه ابن حبان في صحيحه و اللفظ له ، والحاكم وقال: صحيح الإسناد) لە سەحیحەکەی ئیبنو حیبباندا ژمارە (٣٦١)ەو لای الحاکمیش (ب٢ ل ٦٥٢)ە، شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی لە کتێبی (صحيح الترغيب و الترهيب ژمارە ١٣٤)دا دەربارەی ئەو فەرمودەیە دەڵێ: (صحيح لغيره) واتە بە فەرمودەی تری هاوشێوەی، ئەمیش دەچێتە ریزی سەحیحەوە...

دەکات! سەرم لە کەسێك سورِ ماوە، کە دڵنیایە سبەینێ لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت و کاری بۆ ناکات.

### باسی چوارەم: کارپێ کردن ورِازی بون و ملکەچ کردن.

بۆ ئەو حوکمانەی نەسرِراونەتەوە واتە(نەسخ) نەبونەتەوە، جا حیکمەتەکەیان بزانین، یاخود نەزانین، بێگومان هەمو کتێبە پێشوەکان بە قورئان (نەسخ) بونەتەوە .

### باسی پێنجەم: ئیمان هێنان بەوەی قورئان دوایین کتێبە:

کە لە لایەن خوای گەورەوە رِەوانە کراوەو تایبەتی کردوە بەچەند تایبەتمەندییەکەوە، لەوانە:

أ) پوختەی پەیامە خواییەکانی لە خۆ گرتوەو سەلمێنەری ناوەرِۆکەکەیانەو چاودێرە بەسەریانەوە، واتە هەر رِاستییەکیان تێدا بێت دانی پێدا دەنێت، هەر شتێکیان تێکەڵ کرابێت، یان شێوێنرابێت رِونی دەکاتەوە.

ب) تاکە پەیامێکی خواییە، کە بەڵێن بە پاراستنی درابێت، چونکە دوایین پەیامەو گشتییە بۆ تێکرِای مرۆڤایەتی هەتا رِۆژی دوایی، ئەمرِۆ بێجگە لە قورئان کتێبێکی تر نەماوە، کە پەیامی رِاستەقینەی خوای گەورە دابنرێت و پارێزراو بێت، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- ئەو کتێبانەی پێش قورئان رِەوانەکراون، هیچیان نوسخەی (أصل) یان نەماوە، بەڵکو تەنها رِاڤەو وەرگێرِاویان ماوەتەوە.

٢- ئەو کتێبانە هەر وەك فەرمایشتی خوای گەورەن، قسەی خەڵکیشیان تێکەڵ کراوە لە تەفسیرو مێژو داستانی پێغەمبەران و هاوەڵانیان.

٣- ئەو كتێبانە هیچیان پاڵپشتی مێژوویی وایان نییە، كە متمانە پێكراو بێت هەتا بسەلمێت، كە ڕاستە كتێبی خوای گەورەن .

٤- ئەو كتێبانە شێواندنی زۆریان تێ كەوتوە، بە بەڵگەی ئەوەی (نوسخە)ی جیا جیایان زۆرەو وتەو بیروڕای پێچەوانەی یەكتریان زۆر تێدایە.

٥- ئەو كتێبانە بیروباوەڕی پوچەڵ و خراپی زۆریان تێ كەوتوە، كە بە ڕاشكاوی دەری دەخەن و دەیسەلمێنن شێوێنراون .

بۆ نمونە: ئەو تەوراتەی ئەمڕۆ لەبەر دەستدایە، چەندەها نوسەر لەسەردەمی جیا جیادا نوسیویانەتەوە، هەروەها شێواندنی زۆری تێدا كراوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەو تەوراتەی لە لای دیانەكان هەیە ئەوە نییە، كە لە لای جولەكەكانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾النساء/٤٦ واتە: لەوانەی بونەتە جولەكە وتەو فەرمایشت لە جێی خۆی دەگۆڕن و دەی شێوێنن . بەڵگەی ئاشكرا لەسەر ئەم ڕەخنەیەی قورئان زۆرە، لەوانە: لە (سفر التكوين ٦-٦) دا كە نوسخەیەكە لە تەورات هاتوە: (فحَزَنَ الربُّ أنه عَمِلَ الإنسَانَ وتأسَّفَ في قلبِهِ) واتە: پەروەردگار غەمگین بو بەوەی مرۆڤی دروست كردووەو لە دڵەوە پێ ی ناخۆش بو ! یاخود تۆمەتی درۆو زیناكردن دەدەنە پاڵ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، كە هەرگیز لە فەرمایشتی خوا ناوەشێتەوە شتی وا باس بفەرموێت.. یاخود ئەو ئینجیلانەی ئەمڕۆ لەبەر دەستدان (چوار) جۆری سەرەكین لە نزیكەی (حەفتا) نوسخەوە وەرگیراون ! بیرمەندو مێژونوسە دیانە ڕەخنەگرەكانیش دان بەوەدا دەنێن، كە بیروئیمانی ئەو ئینجیلانەی هەن هەموی ڕای (پۆڵس) ن، كە یەكێكە لە ڕاڤەكارانی ئینجیل و چەند سەدەیەك دوای هاتنی سەیدنا

عیسا سەلامی خوای لێ بێت ژیاوە، نەك ڕای حەواری (یاوەرە) نزیکەکانی سەیدنا عیسان بن سەلامی خوای لێ بێت..

ج) خوێندنەوەو تێگەیشتن لە قورئان ئاسانە، چونکە خوای گەورە ناردویەتی بۆ تێکڕایی خەڵکی، هەر کەس مەبەستی بێت لێی بەهرەمەند دەبێ، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾القمر/١٧ واتە: بەڕاستی قورئانمان بۆ خوێندنەوە ئاسان کردوە، ئایا کەس هەیە پەند وەربگرێت؟).

## بەندی دووەم: سێ نمونە لە ئیعجازی قورئان

قورئان کە کۆتا کتێبی خوا گەورەیەو بە جوبرەئیلدا بۆ پێغەمبەری پێشەوامانی ناردوە صلی الله علیه و سلم، بۆ ئەوەی تیشکۆیەك بێت بۆ ئەوانەی مەبەستیانە ڕاستی بدۆزنەوەو شوێنی بکەون، بەڵگەش بێت لەسەر ئەوانەی نکۆڵی لە ڕاستی دەکەن و پشتی لێ هەڵدەکەن، زۆر لایەنی ئیعجازی بە شێوەی جۆراو جۆر لە خۆ گرتوە. لێرەدا بە کورتی نمونەیەك لە سێ لایەنی ئیعجازی دەهێنینەوە:

**نمونەی یەکەم: دەربارەی ئیعجازی مێژویی:**

١. عبدالله ی کوڕی مەسعود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: فارسەکان بەسەر ڕۆمەکاندا سەرکەوتبون، هاوبەشدانەران موشریکەکان پێیان خۆش بو، بەڵام موسوڵمانان حەزیان دەکرد ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا سەرکەون، چونکە خاوەنی پەیامی ئاسمانی بون و لە ئایینەکەیانەوە نزیکتر بون، ئنجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴾الروم/١-٣ واتە: الف، لام، میم، ڕۆمەکان لە نزیکترین، یاخود نزمترین شوێنی زەویدا تێك شکان، بەڵام

دوای تێك شكانەكەیان هەر سەردەكەونەوە. هاوبەش دانەران وتیان: ئەی ئەبو بەكر هاوەڵەكەت دەڵێ: لە ماوەی چەند ساڵێكدا ڕۆمەكان بەسەر فارسەكاندا سەر دەكەون؟ گوتی: ڕاست دەكات، وتیان: ئەی بۆ گرەو نەكەین؟ بەڵێنیان پێدا لەسەر چوار (وشتری گەنج)هەتا ماوەی حەوت ساڵ، حەوت ساڵەكە تێپەڕی و هیچ نەبو، هاوبەشدانەران بەوە دڵخۆش بون، بەلای موسوڵمانەكانیشەوە گران و ناخۆش بو، سەیدنا ئەبوبەكر خوا لێی رازی بێت ئەمەی بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باس كرد، فەرموی: (مَابضعْ سِنِينَ عِندكمْ ؟) واتە: بِضعْ لای ئێوە چەند ساڵە؟ وتیان: لە (دە) كەمترە، فەرموی: (إذهَبْ فزايدْهم وأزدِدْ سَنتين فِي الأجَلِ)واتە: برۆ پێیان زیاد بكەو دو ساڵ بخەرە سەرماوەكە . ئیبن مەسعود خوا لێی رازی بێت دەڵێ: دوساڵەكە تێنەپەڕی بو و هەواڵی سەركەوتنی ڕۆمەكانی هاتە خوارەوە: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ۝٣ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝٤ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾الروم/١-٦ واتە: الف، لام، میم، ڕۆمەكان لە نزیكترین یاخود نزمترین شوێنی زەویدا تێك شكان و ئەوان دوای تێك شكانەكەیان هەر سەردەكەون، لەماوەی چەند ساڵێكی تردا، فەرمان هەر بۆ خوای گەورەیە لەوە پێش و لەوە دواش، ئەو ڕۆژە موسوڵمانان بە سەركەوتنی خوا دڵخۆش دەبن و، خوا بیەوێت هەر كەس سەربخات، سەری دەخات، هەر خۆی شكۆمەندو میهرەبانە، خوا بەڵێنی داوەو بەڵێنی خواش دوا ناكەوێت، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن[1].

---

١- نوسەری بەڕێز دەربارەی سەنەدی ئەم فەرمودەیە هەر ئەوەندەی نوسیوە (اخرجه ابن جرير و

**نموونەی دووەم: دەربارەی ئیعجازی ڕەوانبێژیی.**

خوای گەورە بۆ ئەوەی سەختی سزای دۆزەخ بۆ بێ ئیمانان دەربخات، بەلاّم بە پیشان دانی کەمترین ڕێژەی ئەو سزایە، کە بەو کەمییەش چەندە کاریگەرە، ئەم مەبەستە لە چەند وشەیەکی قورئانداو بە شێوەیەکی دەستەوسانکار(مُعجِز) دەردەبڕێت و دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴾الأنبياء/٤٦ واتە: ئەگەر هەلاّوێك لە سزای پەروەردگارتیان بەر بکەوێت دەڵێن: داماو سەرگەردان خۆین بە ڕاستی ئێمە ستەمکار بوین . لێرەدا دەبینین هەمو پێکهاتی ڕستەکە هاو ئاهەنگن و سەرجەم واتای کەمیەتی دەگەیەنن چونکە:

١) وشەی (لئِن) واتە: ئەگەر بۆ گومان پەیدا کردنەو واتای کەمی دەگەیەنێت.

٢) هەروەها وشەی(مَسَّ) واتە: بەرکەوتنێکی کەم، واتای کەمی چەشتنی ئاگرەکە دەگەیەنێت.

٣) یاخود وشەی(نَفحَة) واتە: هەلاّوێك: لە سێ ڕووەوە واتای کەمیەتی دەبەخشێت:

ا ـ هەلاّو کەمترین ڕێژەی ئاگرە.

ب ـ نَفحَةٌ: چاوگی (مَرَّة) یەو واتای (یەك جار) دەگەیەنێت .

ج ـ نَفحَةٌ تەنوینی نەناسراوی لەسەرە، واتە: هێندە کەمە گوێی پێ نادرێت.

---

ابن حاتم و الترمذي) ئەوەی ئیبنوحاتیمم نەدۆزیەوە، بەلاّم لای ترمزی وحاکم ئاشکرایە(جامع الأصول٢/٢٩٨–٣٠٠)، هەروەها ئیمامی ئەحمەد (المسند٤/١٦٨عەللامە ئەحمەد شاکر) وئیبنوجەریری تەبەری (تفسیر الطبري٢١/١٦) و لە ریوایەتی ئیبنومەسعودەوە (تفسیر الطبري٢١/٢٠) .شێخی ئەلبانیش لە (صحیح سنن الترمذي٣/٨٧) دا دەڵێ سەحیحە.

٤) وشەی (مِن) بۆ (هەند) ە: واتە: (بەشێك)، کە لە (هەمو) کەمترە.

٥) وشەی (عذاب) واتە: سزا، جۆرێکی هێواشی سزایە بە بەراورد لەگەڵ جۆرەکانی تری وەك (نِکال)و (عِقاب)، کە بە قەدەر تاوانن !!

٦) وشەی (ربك) واتە: پەروەردگارت، یەکێکە لەو ناوانەی کە واتای بەزەیی و بەخشندەیی دەگەیەنن، بە بەراورد لەگەڵ ناوی (القهار) و (المنتقم) . ئەمیش میهرەبانی سزا دەرەکە دەگەیەنێت . واتە: ئەگەر سزایەکی ئەوەندە کەم بەو جۆرە بە سوێ و ئازار بێت و بێ ئیمانان بخاتە هاوار و لالانەوەو لە تاویدا دان بە ستەمکاری خۆیاندا بنێن، ئەی دەبێت سزای سەخت و توندی بە قین و ڕقی خوای تۆڵە ستێن و شکۆمەند چەندە بە ئازار بێت و چییان لێ بکات؟

**نمونەی سێیەم: دەربارەی ئیعجازی زانستی: قۆناغەکانی دروست بونی کۆرپەلە.**

دروست کردن سیفەتێکی تایبەتە بە خوای گەورەوەو غەیری خوا ناتوانێت خۆی لەو بوارە بدات چونکە خۆی دروست کراوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (قالَ اللهُ تعَالَى: وَمَنْ أظلَمُ مِمَّنْ ذهَبَ يَخلُقُ كَخَلقِي، فَليَخلقُوا ذَرَّةً أو لِيَخلقُوا حَبَّةً، أو لِيَخلقُوا شَعِيرَةً)متفق عليه واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی دێت و لە شێوەی دروست کراوەکانی من دروست دەکات، یا مێرولە یان گەردیلەیەك دروست بکەن، یان دەنکە تۆوێك دروست بکەن، یاخود دەنکە جۆیەك دروست بکەن . خوای گەورە لە باسی سەرەتای دروست کردنی مرۆڤ و قۆناغەکانی پێك هاتنی کۆرپەلەدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا

ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾المؤمنون/١٢-١٤ واتە: مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ دروست کردوە، پاشان کردومانە بە تنۆکە ئاوێك لە شوێنێکی جێگیردا، کە پزدانە، ئنجا لە تنۆکە ئاوەکە خوێن پارەیەکمان دروست کردوەو لە خوێن پارەکە گۆشت پارەیەکمان دروست کردوە بە ئەندازەی پارویەکی جوراو، لە گۆشت پارەکەش ئێسقانمان دروست کردوە، واتە پەیکەری ئێسك، ئێسقانەکەشمان بە گۆشت داپۆشیوە، ئنجا دروست کراوێکی ترمان لێ پێك هێناوە، پاك و پیرۆزی بۆ خوا، کە چاکترینی دروستکارانە.

گەر سەرنج بدەین، دەبینین هەریەك لەو بڕگانەی لەم چەند ئایەتە پیرۆزەدا هاتون، ڕاستییەکی زانستی دەر دەبڕن و گەورەترین ئیعجازی زانستی دەسەلمێنن، وەك لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین:

١) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴾ واتە: مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ دروست کردوە.. ئەگەر مرۆڤ بگێڕینەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتاییەکانی پێك هاتنی لەشی، دەبینین بیست و دو ڕەگەز بەشداری لە پێکهاتنیدا دەکەن و بەم شێوەیە دابەش دەبن:

أ ـ ئۆکسجین + هایدرۆجین بە شێوەی ئاو، بە ڕێژەی ٦٥-٦٠ ٪، لە کێشی لەش .

ب ـ کاربۆن + هایدرۆجین + ئۆکسجین بنچینەی پێك هاتنە ئەندامییەکان پێك دێنن لە: شەکرەمەنی و پرۆتینات و ڤیتامینات و هۆڕمۆنات .

ج ـ ماددە وشکەکان: کە بەم شێوەیە دابەش دەبن:

★ حەوتیان بریتین لە: کلۆر، کبریت، فۆسفۆر، مەگنیسیۆم، کلس،

پۆتاسیۆم، ستۆدیۆم، کە ڕێژەی ۸۰-٦۰ ٪ ی ماددە وشکەکان پێك دێنن .

★ حەوتی تریان بریتین لە: ئاسن، مس، تۆد، مەنگەنیز، کۆبالْت، تۆتیا، مۆلبیدیۆم، ئەمان بە ڕێژەیەکی کەمتر.

★ شەشیان بە ڕێژەیەکی زۆر کەم، کە بریتین لە: فلۆر، ئەلەمنیۆم، بۆر، سیلینیۆم، کادمیۆم، کرۆم .

هەریەك لەو ڕەگەزانە لە خاکی زەویدا هەن، مەرجیش نییە هەمو پێکهاتەکانی خاك لە پێکهاتەکانی لەشی مرۆڤدا هەبن، چونکە پتر لە ۱۰۰ توخم لە زەویدا هەن، بەلاْم تا ئێستا تەنها بیست و دویان دۆزراوەتەوە، کە بەشداری لە پێکهاتەی لەشدا دەکەن، بۆیە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾ واتە: لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ.

هەروەها پێکهێنەری بنچینەیی لەش ئاوە، کە ڕێژەی ٤/٣ دەبێت و مرۆڤ ناتوانێت بە بێ ئاو لە چوار ڕۆژ زیاتر بژی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ﴾ الأنبياء/۳۰ واتە: لە ئاو هەمو شتێکی زیندومان دروست کردوە.

۲) دەفەرموێت: (ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً..) واتە: پاشان کردومانە بە تنۆکە ئاوێك..

(نُطْفَةً) لە زمانی عەرەبیدا ناوە بۆ تۆوی پیاو، هەرچەندە لێرەدا مەبەست لە تۆوێکی پیتێنراوە لە (تۆو + هێلکۆکەی ئافرەت)، بەلاْم خوای گەورە قۆناغەکانی بە (نطفة) ناو بردوە، چونکە کۆرپەلە (بە نێرو مێیەوە) تۆوی پیاوە، کە لە دیاری کردنی ڕەگەزەکەی بەر پرسیارە، لەبەر ئەوەی (صبغيات)ی جنسی جیاواز هەڵدەگرێت، بە پێچەوانەی هێلکۆکەی ئافرەتەکەوە، کە (صبغيات) ي جنسی هاوشێوە هەڵدەگرێت، بەم شێوەیە

کرداری پیتێنەکە ڕو دەدات:

پیاوەکـە (نطفـة)ي (xy)هەيـە، بـەڵام ئافرەتەکـە هێلکۆکـەی (xx)ی هەیە و بەم شێوەیە کۆرپەلەیان لێ پێك دێت .

تۆوی (y)+ هێلکۆکەی (xy) =(x)نێرینە .

تۆوی (x)+ هێلکۆکەی (xx) =(x)مێینە .

٣) دەفەرموێت: (..فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ) واتە: لـە شوێنێکی جێگیردا، مەبەست لە تۆوە تێکەڵ و پیتێنراوەکەیە، کە لە پزدان (ڕەحم) دا جێگیر دەبێت و بە هۆی دەستە بەر بونی سێ هۆکارەوە پارێزراوە:

ا- لە ڕوی توێژینەوەوە:

١) پزدان دەکەوێتە حەوزێکەوە.

٢) ئەو حەوزە لە دیوارێکی ئێسقانی پێکهاتوە .

٣) پزدان چەندەها ریشاڵی پشتوێنەیی تێدایە، کە لە بەشی جیا جیاوە شۆڕ دەبنـەوە و دەیبەستـنەوە بـە دیـواری سکەوە، یـان بـە ئێسـقانەکانی حەوزەوە.

ب ـ لە ڕوی هۆرمۆنەوە:

پـزدان بـەردەوام دێتـەوە یـەك و گـرژ دەبێـت و دەجوڵێـت، ئەگـەر لـە کاتێکـا، کـە کۆرپەلـەی تێدایـە هـەر بـەو شـێوەیە لـە گـرژ بونـەوەو خاوبونـەوەدا بێـت، ئـەوا کۆرپەلەکـە دەخاتـە مەترسـیی مرانـدن و لەباربردنی. بەڵام خوای گەورە مشوری خـواردوە، چـونکە کاتێـك تۆوەکـە دەچێتە پزدانەوە، ڕێژەی ڕژانی هۆرمۆنی (بروجیسترون) بەرز دەبێتەوە، بەو هۆرمۆنەش پزدان لە گرژ بون و خاوبونەوە دەکەوێت و جوڵـەی کـەم دەبێت.

ج ـ لە ڕوی میکانیکییەوە:

دوای مـانگی سـێیەم پـزدان بـە شـێوەیەکی بەرچـاو دەسـت بـە بـەرز بونەوە دەکات بەرەو سك و لەژێر پارێزگاری ئێسقانی حـەوز دەردەچێت، بەڵام لە بری ئەوە خوای گەورە شلەی (ئەمنیوسی) تێدا دروست دەکات و لـە هـەمو لایەکـەوە دەورەی کۆرپەلـە دەدات و لـە پێـك دادانـی دەرەکـی دەیپارێزێت .

٤) دەفـەرموێت: (ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ) واتـە: پاشـان لـە تنۆکـە ئاوەکـە خوێن پارەیەك دروست دەکەین:

(علَق) لە زمانی عەرەبیدا بە زەرو دەوترێت. لە هەمان کاتیشدا واتـای هەڵواسین دەگەیەنێت، ئنجا کۆرپەلەش لەم قۆناغەیدا هەم لە (زەرو)ە، دەچێت و هەم خۆی بە دیواری پزداندا هەڵدەواسێت.

٥) دەفەرموێت: (فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ) واتە: لە خوێن پارەکە گۆشـت پارەیەك دروست دەکەین:

(مُضْغَةً )بـە پارچـە گۆشـتێك دەوترێـت پارویـەك ببێـت، چـونکە کۆرپەلە لەم قۆناغەیـدا گۆشـتپارەیەو لـە هـەمان کاتـدا لـە پـاروی جـوراو دەچێت و گرنـج گرنجە، ئەم قۆناغە دو حاڵەتی هەیە:

یەکەمیان: پێی دەوترێت (مُضغَةٌ غَيرَ مُخَلقَةٍ)کـە هێشـتا گۆشـتپارەکە، هیچ شێوەیەکی لێ دروست نەکراوە.

دوەمیان: پێی دەوترێت: (مُضغَةٌ مُخَلقَةٌ)، کە لـەم حاڵەتـەدا گۆشـتپارە، کە سەرجەم ئەندامەکان و شێوەی تەواوی مرۆڤی لێ دروست دەکرێت.

٦) دەفەرموێت: (فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ) واتە: لـە گۆشـتپارەکە ئێسـقانێك دروسـت دەکـەین، ئێسـقانەکەش بـە گۆشـت دادەپۆشـین . لـەم قۆناغـەدا

پەیکەری ئێسکی کۆرپەلە بە تەواوی لە گۆشتپارەکە دروست دەبێت، ماسولکەو گۆشت دەورەی دەدەن و پێوەی دەلکێن.

٧) دەفەرموێت: (ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ) واتە: ئنجا دروستکراوێکی تری لێ پێك دەهێنین . هەتا ئێستا کۆرپەلە لە قۆناغی دروست بوندا بوەو هیچ جوڵەو گەشەیەکی زیندوییانەی نەبوە، بەڵام لە سەرەتای ئەم قۆناغەوە، کە لە کۆتایی مانگی سێیەم و سەرەتای مانگی چوارەمەوەیە، کۆئەندامەکانی لاشەی بە تەواوی دروست دەبن و دەست دەکەن بە فرمانی خۆیان و بە شێوەیەکی خێرا کێشی کۆرپەلەکە زیاد دەکات، لە سەرەتای مانگی چوارەمەوە کۆئەندامی مێشك دەبەسترێتەوە بە سەرجەم کۆئەندامەکانی ترەوەو تێکڕایان جوڵەو کاری خۆیان دەست پێ دەکەن و بە شێوەیەکی بەرچاو گەشە دەکەن .

(کیپ . ل . مور) کە پرۆفیسۆری زانستی توێژینەوەو کۆرپەلەناسییە لە زانکۆی (تۆرنتۆ)ی کەنەداو خاوەنی کتێبی (قۆناغەکانی دروست بونی مرۆڤ...the developing human)ە، کاتێك لە کۆنگرەی نوشداری هەشتەمی سعودیدا بەشداری کردو ئەم بەڵگانەی بۆ خوێنرایەوە، کە لە قورئان و سوننەتدا هاتون، بە تایبەتی ئەو ئایەتەی، کە لێرەدا باسمان کرد وتی: بۆم دەرکەوتوە، کە ئەم بەڵگانە حەتمەن لە لایەن خواوە بۆ (محمد) هاتون، ئەمەش دەیسەلمێنێت، کە محمد نێرراوی خوایە .

**ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر قورئان:**

١) پاراستنی پیرۆزی و ڕێزی قورئان: واتە بە پاکی دەستی لێ بدەین و هەڵی بگرین، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعة/٧٧-٧٩ واتە: ئەمە قورئانێکی بەڕێزە، لە کتێبێکی پارێزراودایە، تەنها ئەوانە دەستی لێ دەدەن، کە

خۆیان خاوێن و پاکژ کردۆتەوە.

٢) خوێندنەوەو لەبەر کردنی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إقْرَؤا القرآنَ فإنَّهُ يَأتي يَومَ القِيامَةِ شَفِيعاً لِأصحَابِهِ)رواه مسلم[١] . واتە: قورئان بخوێننەوە، چونکە ڕۆژی دوایی دێت و دەبێتە تکاکار بۆ خاوەکەی.

٣) فێر کردنی خەڵکی و خوێندنی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (خَيرُكُمْ مَنْ تعَلَمَ القُرانَ وَعَلَمَهُ)روا البخاري[٢] واتە: چاکترینتان کەسێکە، کە فێری قورئان ببێت و خەڵکی فێر بکاتەوە .

٤) بیر کردنەوە لە واتاکەی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ محمد/٢٤ واتە: ئایا بۆ لە قورئان ورد نابنەوە؟ یان دڵیان قفڵی لێدراوەو توانای بیر کردنەوەیان نەماوە ؟

٥) پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إقْرَؤا القُرانَ واعمَلُوا بهِ ولا تَأكلُوا بهِ)رواه احمد وهو صحيح[٣] واتە: قورئان بخوێننەوەو کردەوەی پێ بکەن، بژێوی و خواردنی پێ پەیدا مەکەن.

---

١ـ موسلیم (٥٥٣/١ ژ ٨٠٤). شاهیدی تریشی لەسەر هەیە بۆ نمونە: (الصيامُ والقرآنُ يَشفَعانِ للعبد يومَ القيامَةِ ، يقولُ الصيامُ: أي رَبِّ مَنَعْتُهُ الطعامَ والشَّهْوَةَ فَشَفِّعْني فيه ويقولُ القرآنُ: مَنَعْتُهُ النَّومَ بالليلِ فَشَفِّعْني فيه . قالَ: فَيَشْفَعَانِ) ئەلبانی لە (صحيح الترغيب و الترهيب ٩٨٤) دەڵێ: حسن صحيح

٢ـ بوخاری (١٩١٩/٤ ژ٤٧٣٩) ئەبوداود (٤٦٠/١ ذ ١٤٥٢) ترمزي (١٧٣/٥) دەڵێ حەدیسێکی (حسن صحيح) ە، بەڵام شێخی ئەلبانی لە هەمو توێژینەوەی خۆیدا (السلسلة الصحيحة ذ ١١٧٣ " وصحيح أبي داود ٢٧٢/١ ژ ١٢٨٩) وصحيح سنن الترمذي ١٧٣/٥دەڵێ سەحیحە.

٣ـ نوسەری بەڕێز وای نوسیوە، بەڵام زۆر گەڕام بەو دەقە نە لای ئیمامی ئەحمەدو نە لای ئەوانی تر نەمدۆزیەوە، بەڵام فەرمودەی تری سەحیح لای ئیمامی ئەحمەدو ئەوانی تر هەیە، کە هەمان مانا دەبەخشێت ، وەکو: (اقرَءوا القرآنَ و اعْمَلوا بهِ و لا تَجْفوا عنهُ و لا تَغْلوا فيه و لا تَأكُلوا به و لا تَستَكثِرُوا به)رواه أحمد والطبراني وغيرهما ، هەیسەمی دەربارەی دەڵێ : (رجالهُ ثقات)حافز ئیبنو حەجەریش لە فتح الباريدا دەڵێ: (وسَنَدُه قوي) شێخی ئەلبانیش لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة (٢٦٠ و ٣٠٥٧)، صحيح الجامع ذ ١١٦٨) دا دەڵێ سەحیحە.

# پایەی چوارەم

# ئیمان هێنان بە پێغەمبەرانی خوا

**بەندی یەکەم: پێغەمبەرانی خوا بە گشتی.**

**- باسی یەکەم: سیفاتی پێغەمبەرێتیەکانیان.**

**- باسی دوەم: سیفاتی مرۆڤایەتییان.**

**بەندی دوەم: ئیمان هێنان بە نێرراوێتی سەیدنا محمد صلى الله عليه و سلم**

**- باسی یەکەم: ناسینی کەسایەتێتی.**

**- باسی دوەم: پێغەمبەرێتی و موعجیزەکانی.**

**- باسی سێیەم: ئەرکمان بەرامبەری.**

**- پاشکۆ: کاریگەریی ئیمانبون بە پێغەمبەران لەسەر ژیانی ئیماندار.**

## پایەی چوارەم: ئیمان هێنان بە پێغەمبەرانی خوا

ئیمانهێنان بە پێغەمبەران واتە ئیمان هێنان بەو نێرراو (الرُسُل) و هەڵبژێرراو (ألأنبياء) ئەوانەی، کە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا باسی کردون، بەوانەش کە باسی نەکردون.

- نێرراو واتە (رسول): ئەو کەسەیە، کە خوای گەورە سروشی بۆ دەکات و پەیام و شەریعەتی بۆ دەنێرێت و فەرمانی پێ دەکات بە خەڵکی ڕا بگەیەنێت.

- پێغەمبەر واتە (نبي): ئەو کەسەیە، کە خوای گەورە سروشی بۆ دەکات، بەڵام فەرمانی پێ ناکات بە خەڵکی ڕا بگەیەنێت، بەڵکو لەسەر شەریعەتی پێغەمبەرەکەی پێشوی دەڕوات و لە ناو خەڵکیدا پیادەی دەکات، بەم پێیە: هەمو نێرراوێك پێغەمبەرە، بەڵام هەمو پێغەمبەرێك نێرراو نییە.

## بەندی یەکەم: پێغەمبەرانی خوا بە گشتی

### باسی یەکەم: سیفاتی پێغەمبەرێتییان

**یەکەم: ئیمانهێنان بەوەی ڕەوانە کران و هەڵبژێرانیان لە لایەن خوای گەورەوەیە.**

هەروەها ئەو پەیام و شەرعەش، کە هێناویانە سروشەو لە خواوە بۆیان کراوە.. ئیمان نەبون بە یەکێکیان، یاخود بە درۆ زانینی بێ ئیمانی و بە درۆ زانینی سەرجەم پێغەمبەرانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ

مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾البقرة/١٣٦ واتە: بڵێن: ئیمانمان هێناوە بە خواو بەو پەیامەی بۆمان ڕەوانە كراوەو بەوەش، كە ڕەوانە كراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و وەچەكانی یەعقوب ئەوەی بۆ موساو عیساو سەرجەم پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لە پەروەردگاریانەوە هاتوە، جیاوازی ناكەین لە نێوان هیچیاندا، ئێمە مل كەچ و گوێڕایەڵی خواین.

هەروەها دەربارەی گەلی نوح علیە السلام دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ﴾الشعراء/١٠٥ واتە: گەلی نوح نێرراوانیان بە درۆ خستەوە، هەرچەندە بێجگە لە نوح سەلامی خوای لێ بێت، نێرراوی تریان بۆ ڕەوانە نەكرابو، بەڵام خوای گەورە هەر بە بەدرۆ خەرەوەی تێكڕای پێغەمبەرانی داناون، چونكە پێغەمبەرەكەی خۆیان بە درۆ خستەوە .

**دووەم: ئیمانهێنان بەو پێغەمبەرانەی كە ناویان دەزانین و نایزانین كە لە قورئاندا ناوبراون.**

بەوانەش كە ناویان نازانین و باس نەكراون، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴾غافر/٧٨ واتە: ئەی موحەممەد صلی الله علیە وسلم لە پێش تۆوە چەندەها نێرراومان ناردوە، هەندێكیانمان بۆ باس كردویت و هەندێكیانمان بۆ باس نەكردویت. ئەوانەی لە قورئاندا ناویان هاتوەو باس كراون، ئەم بیست و پێنج پێغەمبەرەن:

(ئادەم، نوح، ئیدریس، ئیبراهیم، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، ئەیوب، داود، سولەیمان، موسا، هارون، زەكەریيا، یەحیا، عیسا، ئیلیاس،

ئەلیەسەع، یونس، لوط، هود، سالح، شوعەیب، ذا الکفل، موحەممەد)سەلامی خوا لە هەمویان.. ژمارەی سەرجەم پێغەمبەرانیش نەزانراوە، بێجگە لە خوای گەورە کەس نایزانێت .

**سێ یەم: ئیمانهێنان بەو داستان و هەواڵەڕاستانەی کە دەربارەیان پێمان گەیشتون:**

بۆ نمونە: نوح سەلامی خوای لێ بێت نۆسەد و پەنجا ساڵ پێغەمبەرایەتی و بانگەوازی کردوەو پاش ئەوەی هەر بڕوایان پێ نەهێناوە، خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە کەشتییەك دروست بکات و هاوەڵە موسوڵمانەکانی و نێرو مێیەك لە هەر گیاندارێك کە بە دەوریەوە بون سوار بکات، سەرئەنجام خوا لافاو تۆفانێکی هەستاندو بێجگە لە نوح و ئەوانەی ناو کەشتییەکە ئەوانەی تر لە ناو چون .

**چوارەم: ئیمانهێنان بە سەرجەم پێغەمبەران بەو جۆرەی خوای گەورە بۆی باس کردوین.**

واتە بە سیفەتی ڕاستەقینەی خۆیان وەکو مرۆڤ و پاشان، وەکو کەسایەتیەك، کە خوای گەورە هەڵیبژاردون و سروشی خۆی بە جوبرەئیلدا بۆ ناردون..

## باسی دووەم: سیفەتی مرۆڤانەیان

أ - هەمو تایبەتمەندییەکی مرۆڤیمان تێدایە لە: نەخۆش کەوتن و مردن و لە بیرچونەوەو ژن هێنان و خواردن و خواردنەوە و.. هتد لە سیفەتەکانی مرۆڤ، خوای گەورە دەربارەی ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت، کە وەسفی پەروەردگاری کردوە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي

وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾الشعراء/٧٩-٨٠ واته: پەروەردگارم ئەو خوایەیە، کە خواردن و خواردنەوەم پێ دەدات، ئەگەر نەخۆش کەوتم چاکم دەکاتەوە، ئەو خوایەیە دەم مرێنێ، پاشان زیندوم دەکاتەوە .

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إنَّمَا أنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أنْسَى كَمَا تَنْسُونَ، فَإذا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي)متفق عليه[١] واته: من وەك ئێوە مرۆڤم ، شتم بیر دەچێت هەروەك ئێوە شتتان بیر دەچێت، ئەگەر بیرم چو بیخەنەوە یادم.

ب - چاکترین پلەو پایەو جوانترین نازناویان بەندایەتییە، واتە: بەندەو پێغەمبەری خوان، لەوە زیاتر هیچ تایبەتمەندییەکی پەروەردگار و پەرستراویان نییە، چونکە نەغەیب دەزانن، نەتواناشیان بەسەر ڕێسای گەردون وژیاندا هەیە.

ج - کاری سەرەکی ئەوان بانگەوازی خوایی و رون کردنەوەی دین وشەریعەتەکەیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴾الأنبياء/٢٥ واته: ئەی موحەمەد صلی الله علیه وسلم هەر پێغەمبەرێك لە پێش تۆوە ڕەوانە کردبێت، سروشمان بۆ کردوە، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە، بێجگە لە من، کەواتە بمپەرستن.. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (و الأنبياءُ إخْوَةٌ.. وَدِينُهُمْ واحِدٌ) متفق عليه[٢]واته: پێغەمبەران بران و... ئاینەکەیان یەکێکە. هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ

١ ـ بوخاری (٤٠)، موسلیم (٥٧٢).

٢ ـ بوخاری (٣٤٤٣)، موسلیم (٢٣٦٥)ئەمەش لەفزی بوخاریە .

إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾الأنعام/٤٨-٤٩ واتە: هەر نێراوانێکمان ڕەوانە کردبێت مژدەدەرو ترسێنەر بون، ئنجا هەرکەس ئیمانی هێنا بێت و چاکەکار بوبێت، ئەوا ترسی لەسەر نەبوەو خەفەتی نەخواردوە، ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ زانیبێت، ئەوا سزا دەچێژن بە هۆی ئەو سەرکەشییەوە، کە کردویانە.

## بەندی دووەم: ئیمان هێنان بە محمد صلی الله علیه وسلم

ئیمان هێنان بە پێغەمبەری ئیسلام محمد صلی الله علیـە وسـلم چـەند باسێکە:

### باسی یەکەم: ناسینی لەڕوی کەسایەتی و پێغەمبەرایەتییەوە:

واتە زانینی ڕەچەڵەك و سیما سەرەکییەکانی و ڕەوتی ژیانی:

١) **ڕەچەڵەکی:** پێغەمبەری خوا صلی الله علیـە وسـلم شـەرەفمەندترین ڕەچەڵەکی هەیـە، نـاوی محمدی کوڕی عبدالله کوڕی عبـد المطلب کوڕی هاشمە، هاشم لە تیرەی قوڕەیشە، قوڕەیش لە هـۆزی کینانەیـە، کینانـە لـە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خۆشەویستی خوایـە سـەلامی خوایـان لـێ بێـت، هـەروەك پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێت: (إنَّ اللهَ اصطفى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ اسمَاعيلَ و اصطفَى قُرَيشاً مِنْ كِنَانَـةَ واصـطفَى مِـنْ قُرَيشٍ بَـني هَاشِـمَ واصـطفَى مِـن بَنِـي هَاشِـمَ)اخرجـه مسـلم[١] واتـە: خـوای

---

١ ـ موسلیم (٧/٥٨)ئیمامی ئەحمەد (٣٦/٤٠٤)، ترمزی (١٣/١٨٥).

گەورە کینانەی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژارد، قورەیشی لە کینانە هەڵبژاردو بەنی هاشمی لە قورەیش هەڵبژارد، منیشی لە بەنی هاشم هەڵبژارد.

٢ ) **ناوەکانی:** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناوەکانی هەڵقوڵاوی ئەرك و فەرمانەکانین، ئەم پێنج ناوەی هەیە: محمد، احمد، الماحی، الحاشر، العاقب. وەك خۆی دەفەرموێت: (أنَا محمد و أنَا أحمدُ و أنَا الماحي الذي يُمحَى بي الكفرُ، و أنَا الحاشِرُ الذي يُحشَرُ النَاسُ عَلَى عَقِبي، وأنَا العاقِبُ، والعاقِبُ الذي ليسَ بَعدَهُ نَبيٌّ)متفق عليه و اللفظ لمسلم[١] واته: من موحەممەدم و من ئەحمەدم و من (الماحی)م کەوا بێ ئیمانیم پێ دەکوژێتەوەو من (الحاشر)، کە خەڵکی بە شوێنمدا حەشر دەکرێن و من (العاقب)م و (العاقب) یش ئەو پێغەمبەرەیە کە هیچ پێغەمبەری تری بە دوادا نایەت.

٣ ) **لە دایك بون و ژیان و تەمەنی:** پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە مەککە لە دایك بوەو پەنجا و سێ ساڵ لەوێ ژیاوە، پاشان کۆچی کردوە بۆ مەدینەو دە ساڵ لەوێ ماوەتەوەو هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوەو سەرجەم تەمەنی پیرۆزی شەست و سێ ساڵ بوە .

## باسی دووەم: پێغەمبەرێتی محمد صلی الله علیه وسلم و موعجیزەکانی.

لە ڕوی پێغەمبەرایەتییەوە: واتە زانینی کات و بەڵگەی بە پێغەمبەر بونی، هەروەها ماوەی پێغەمبەرایەتی و بەڵگەکانی ڕاستیەتی و تایبەتمەندییەکانی.

---

١ - بوخاری (٣٥٣٢)، موسلیم (٢٣٥٦)، ترمزی (٢٨٤٠)، نەسائی (١١٥٢٦ ).

**١) کات و بەڵگەی بە پێغەمبەر بونی:**

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە تەمەنی چلساڵیداو بە ئایەتی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ...﴾ العلق/١-٢ واتە: بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە دروستکارە مرۆڤی لە خوێن پارە دروست کردوە. کراوە بە هەڵبژێرراو، پاشان بە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ...﴾ المدثر/١-٣ واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە، هەستەو خەڵکی ئاگادار بکەرەوەو پەروەردگارت بە گەورە بگرە... کراوە بە نێراو، ماوەی بیست و سێ ساڵ پیغەمبەرایەتی کردوە.

**٢) بەڵگەی ڕاستیەتی پیغەمبەرایەتی ( محمد ) صلی الله علیه وسلم:**

بەڵگەی زۆر هەیە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە لەوانە:

ا- بەڵگەی ژیریی: ئاشکرایە ئەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، یان ڕاستگۆترین کەسە، یاخود درۆزنترین کەسە، چونکە، یان ڕاستە پێغەمبەرەو هەتا سەر دەیسەلمێنێت ئەو هەواڵانەی، کە ڕایان دەگەیەنێت ڕاستن و ئەو فەرمانانەی دەریان دەکات ڕاست و بە جێن و ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدات سود مەندن و لەگەڵ وتەکانیدا یەك دەگرنەوەو ڕاستگۆیی و چاکەکاری و دڵسۆزی و لە خوا ترسانی لێوە دەر دەکەوێت، ئەوە نکۆڵی لێ ناکرێت و پێغەمبەرە، یاخود درۆزنەو بانگەشەکەی بۆ ناچێتە سەر، ئنجا هەواڵەکانی بە درۆ بکەونەوە، یان فەرمانەکانی نادروست و نابەجێ بن و نیازێکیان لە پشتەوە بێت، یان کردەوەکانی زیان بەخش بن و پێچەوانەی وتەو دروشمەکانی بن، یاخود درۆو خراپەو نەزانی لێوە دەرکەوێت، ئەوە درۆزنەو لە ماوەیەکی کەم زیاتر بۆی ناچێتە سەر، چونکە هەرگیز درۆزنێك ناتوانێت هەتا سەر لە

بەرگی ڕاستگۆدا خۆی پیشان بدات، چونکە (پەتی درۆ کورتە) . پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (وإنّهُ سَيَكونُ مِنْ أمَّتِي كَذّابون ثلاثون، كُلُّهُمْ يَزعَمُ أنّهُ نَبي، وأنَا خَاتمُ النّبيينَ، لا نَبيَّ بَعْدِي)[١]. واتە: لە ئوممەتەکەمدا سی درۆزن پەیدا دەبن، هەمویان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە پێغەمبەرن... بەڵام من دوایین پێغەمبەرم، لە دوای من پێغەمبەری تر نییە.

ئنجا ئەو درۆزنانە ناوبەناو دەرکەوتون و دەر دەکەون، بەڵام سەرئەنجام درۆو تەڵەکەبازییان دەرکەوتوەو ئاشکرا بوە لەوانە: موسەیلەمەی کەززاب و ئەسوەدی عەنەسی و موختاری کوڕی ئەبوعوبەیدی سەقەفی و میرزا ئەحمەدی قادیانیەکان و بەهائوڵڵای بەهائیەکان و.. هتد.

ب ـ موعجیزەکان: پێغەمبەری ئیسلام صلى الله عليه وسلم دو جۆر موعجیزەی هەیە:

١) موعجیزە بەر هەستەکان: مەبەست لەو ڕوداوانەیە، کە لە ڕێسای ژیان بە دەرن و لەسەر دەستیدا ڕویان داوەو بەڵگەی کاتی بون، وەك: لەت بوی مانگ و سڵاو لێکردنی بەردو هاتنە دەرەوەی ئاو لەنێوانی پەنجەکانیەوەو گریەو ناڵەی قەدی دارخورماو تێر کردنی خەڵکێکی زۆرلە خواردنێکی کەم.. هتد، لەو موعجیزانەی، کە لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتون.

---

١ ـ نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: (رواه احمد و ابو داود و سنده صحيح)بەڵام ئەمە فەرمودەیەکی سەحیح وبەناوبانگی ناو فەرمودەوانانە، لای ئیمامی بوخاری (٣٦٠٩) و موسلیم (١٥٧)، زیادەیەکیشی هەیە، کە دەفەرموێ (وإنَّهُ سَيكونُ في أُمَّتي كَذَّابونَ ثَلاثونَ ، كُلُّهمْ يَزْعُمُ أنَّهُ نَبيٌّ، وأنَا خَاتَمُ النَّبيين، لا نَبيَّ بَعدي، وَلا تَزَالُ طائفَةٌ من أُمَّتِي عَلَى الحَقِّ مَنْصُورَةً، لا يَضُرُّهمْ مَنْ خَذَلَهُم ولا مَنْ خَالَفَهُم حَتَّى يَأْتيَ أَمْرُ الله تَبَارَكَ وَتَعَالَى)، ترمزی (٢٨٨٩)، ئەبوداود (٤/٤٥١ ٤٢٥٢)، ئیبنوماجە (٢/١٣٠٤ ٣٩٥٢)، ئیمامی ئەحمەد (٥/٢٧٨ ).

۲) موعجیزەی زانستیانە: مەبەست لە موعجیزەیەکە، بەردەوام زانستی تێدا بەدی بکرێت و ژیری بیسەلمێنێت، کە زادەی بیرو توانای مرۆڤ نییەو کەسی تر نەتوانێت پێی هەڵسێت، ئنجا بەو پێودانگەی، کە پێغەمبەری ئیسلام صلى الله عليه وسلم دوایین پێغەمبەرەو پەیامەکەی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتییە، تا ڕۆژی دوایی، خوای گەورە موعجیزەیەکی زانستیانەی بەردەوامی وای پێداوە، کە لەگەڵ ڕادەی پێگەیشتنی بیرو ئاوەزی خەڵکیدا بگونجێت و هەر لە سەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە بەربەرەکانێ (تحدّي)ی خەڵکی کردوە، بەردەوامیش دەیکات هەتا مرۆڤ لەسەر زەوی بژی و ژیانی دنیای بمێنێت، ئەویش (قورئان)ە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾البقرة/۲۳-۲٤ واتە: ئەگەر ئێوە لە گوماندان بەرامبەر بە ڕاستیەتی ئەو قورئانەی ناردومانە بۆ بەندەکەمان، ئەوا یەك سورەت بە وێنەی بێنن و بۆ ئەم مەبەستە هەمو شایەت و پشتیوانەکانتان بێجگە لە خوا بانگ بکەن، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، ئنجا ئەگەر نەتان کردو ناشی کەن، ئەوا لە ئاگرێك بترسن، کە سوتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە بۆ بێ ئیمانان ئامادە کراوە .

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَا مِنَ الأنبياءِ نَبيٌّ الَّا أُعطِيَ مَامِثلُهُ أمِنَ عَليهِ البَشَرُ، وإنَّمَا كانَ الذي أوتِيتهُ وَحيَاً أوحَاهُ اللهُ الَيَّ، فأرجُوا أن أكونَ أكثرَهُمْ تابِعاً يَومَ القِيامَةِ)روا البخاري و مسلم[1] واتە: هەر

۱- بوخاری (۳/۹ ژ ٤۹۸۱)موسلیم (۱۳٤/۱ ژ ۱٥۲).

پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران موعجیزەیەکی بە وێنەی ئەو موعجیزانە پێدراوە، کە خەڵکی ئیمانیان پێ هێناوە، بەڵام ئەو موعجیزەیەی، کە بە من دراوە سروشەو خوا نیگای کردوە بۆم، تکام وایە لە ڕۆژی دوایی دا زۆرترین شوێن کەوتوم هەبێت.

ئنجا ئەوەی بە تەواوی ساغی دەکاتەوەو دەیسەلمێنێ، کە ئەو بەڵگانە مەسەلەی ڕاستیەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یەکالا دەکەنەوە، ئەم سێ خاڵەیە:

ا- ڕاستگۆیی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: ئەو هەمو هەواڵ و فەرمایشتانەی کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕاگەیاندون ڕاست و دروست بون و ڕاستگۆیی لە شیمەی سەرەکی خۆشی بوە، هەتا لە پێش پێغەمبەرایەتیشدا بە شایەتی دۆست و دوژمنی هەر وەك (هیرەقل) گەورەی ڕۆمەکان لە ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی پرسی: (فَهَلْ كُنتمْ تتهِمُونَهُ بِالكَذِبِ قبْلَ أنْ يَقولَ مَا قالَ ؟) واتە: ئایا پێش ئەوەی بڵێ من پێغەمبەرم، ئێوە دەکرد بە درۆ کردن تۆمەتدارتان؟ وتی: نەخێر... هەرچەندە ئەبو سوفیان لەو ڕۆژەشدا یەکێك بو لە دوژمنە سەر سەختەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.. رواه البخاری[1].

ب- خۆنەویستی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: وەك بە شێوازی ژیان و گوزەرانیدا دەر دەکەوێت، هەرگیز دنیاوویستی پاڵی پێوە نەناوە بۆ ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات، بەڵکو ئێجگار خۆ نەویست بوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان مەبەستی نەبوە ماڵ و سامان، یاخود پلەو پایەو دەسەلاتی دەست بکەوێت، چونکە ماڵەکەی وەك سادەترین ماڵی خەڵکی وا

---

١ ـ بوخاری: کتاب بدو الوحی (٦).

بوە، جار هەبوە دو مانگ ئاگر لە ماڵیدا نەکراوەتەوە، هەرگیز لە نانی جۆش تێری نەخواردوە، کاتێکیش کۆچی دوایی کردوە زرێکەی لای جولەکەیەك بارمتە بوە. لەم بارەیەوە هیرەقل پرسیاری لە ئەبو سوفیان کرد: (فَهَلْ كَانَ مِن آبَائِهِ مِنْ مَلِكٍ؟)واتە: ئایا هیچ یەکێك لە باو باپیری پاشا بوە؟ ئەویش وتی: نەخێر، پاشان هیرەقل پێی وت: (وَسَأَلْتكَ: هَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مِن مَلِكٍ ؟ فَذَكَرْتَ أَنْ لا ! قُلْتُ: لَو كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ، قُلتُ: رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ أَبِيهِ)رواه البخاري واتە: پرسیارم لێ کردیت: ئایا هیچ یەکێك لە باو باپیری پاشا بوە ؟ وتت: نەخێر، وتم: ئەگەر یەکێك لە باو باپیری پاشا بوایە دەم وت: کابرایەکە موڵك و سامانی باپیری دەوێتەوە.

ج - نەخوێندەواری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾العنکبوت/٤٨ واتە: ئەی موحەمەد صلی الله علیه وسلم تۆ لە پێش ئەم قورئانەدا، نە هیچ نوسراوێکت دەخوێندەوە، نە بە دەستیشت دەتنوسی، کەواتە نارەوایان هەر گومان دەبەن.

پێغەمبەری پێشەوا صلی الله علیه وسلم نە خوێندەوار بوەو هیچی دەربارەی پێغەمبەرایەتی و زاتی خوای پەروەردگار نەزانیوە، لەسەر دەستی کەسیش فێری دانایی و زانست نەبوە، جگە لەو قورئانەی خوای گەورە شەرەفمەندی کرد پێی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی گەیاندە ئەنجام، کە هیچ خوێندەوارێکی بلیمەتی پسپۆری لێبڕاو بەشێکی کەمی ئەو کارەی پێ ئەنجام نادرێت.

٣) تایبەتمەندییەکانی: پێغەمبەری ئیسلام صلی الله علیه وسلم شەش تایبەتمەندی بەسەر پێغەمبەرانی تردا هەیە، ئەوانیش:

أ ـ وتەی کورت و پڕ مانای پێدراوە، واتە: دەربڕی واتایەکی زۆر بە وتەیەکی کورت و کەم دەکات.

ب ـ بە سڵ لێکردنەوە سەرخراوە، واتە: هێندە بە سام و هەیبەتە دوژمنەکەی لە دورەوە سڵی لێ دەکات و شکست دەخوات و ورەی دەڕوخێت.

ج ـ دەستکەوتی جەنگ (غەنیمەت)ی بۆ حەڵاڵ کراوە، بە پێچەوانەی پێغەمبەرانی ترەوە، کە بۆیان نەبوە لێی هەڵگرن و بۆ خۆیان بە کاری بهێنن .

د ـ زەوی بۆ کراوە بە پاکژ کەرەوەو جێگەی نوێژ، واتە: لە کاتی نەبونی یاخود بەکار نەهاتنی ئاودا بە تۆزی خاك (تەیەمموم) دەکرێت، لە هەمو جێگەیەکیشدا دروستە نوێژ بکرێت و پێویستی بە شوێنی تایبەتی نییە.

هـ- بۆ لای تێکڕای خەڵکی ڕەوانە کراوە: بە پێچەوانەی پێغەمبەرانی ترەوە، کە هەریەکەیان بۆ لای گەلێکی دیاریکراو ڕەوانە کراوە .

و- دوایین پێغەمبەرەو پێغەمبەری تری بە دوادا نایەت: وەك دەفەرموێت: (مَثلِي وَمَثلُ الأنبيَاءِ كَمَثلِ رَجُلٍ بَنَى بُنيانًا فَأحْسَنَهُ و أجْمَلَهُ إلَا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ هَلَا وُضِعَتْ هذِهِ اللَبِنَةُ قَالَ: فَأنَا اللَّبِنَةُ و أنَا خَاتمُ النَّبِيينَ) متفق علیه[١] واتە: نمونەی من وپێغەمبەران وەك نمونەی پیاوێك وایە، کۆشکێکی

---

١ ـ بوخاری (٣٥٣٥)موسلیم (٢٢٨٨).

بنیاد نابێت و چاكی كردبێ و جوانی كردبێت، تەنها جێگەی خشتێكی لە سوچێك لە سوچەكانیەوە مابێت، خەڵكی بە دەوریدا بگەڕێن و سەریان لە خۆشییەكەی سوڕ بمێنێ و بڵێن: خۆزگە ئەو خشتەش دابنرایە، ئنجا دەفەرموێت: من ئەو خشتەم و من دوایی پێغەمبەرانم. بەڵگەی ئەو شەش تایبەتمەندییەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەیە دەفەرموێت: (فُضِّلْتُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ )[1] واتە: ڕێزم دراوە بەسەر پێغەمبەراندا بە شەش سیفەت: وتەی كورت و پڕ مانام پێدراوەو بە سڵ لێكردنەوە سەر خراوم، غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ كراوە، زەویم بۆ كراوە بە پاكژ كەرەوەو جێگەی نوێژ، ڕەوانە كراوم بۆ لای خەڵكی بە گشتی و پێغەمبەرانم پێ دوایی هاتوە.

## باسی سێیەم: ئەركەكانمان لە بەرامبەریدا.

١) خۆشویستنی خوّی صلى الله عليه وسلم و بنەماڵەو هاوەڵە بەڕێزەكانی:

٢) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەربارەی خۆشویستنی خۆی دەفەرموێت: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ) متفق عليه[2] واتە: ئیمانی هیچ كامتان تەواو نابێت، هەتا من لەلای خۆشەویست تر نەبم لە باوكی و كوڕی و هەمو خەڵكی.

---

١ ـ بوخاری (٤٢٧)، موسلیم (٤٢١ ، ٨١٢).

٢ ـ بوخاری (١٥)، موسلیم (٤٤).

٣) هەروەها دەربارەی چاکەکاری و ڕێز گرتنی بنەماڵەو خێزانی دەفەرموێت: (.. وَأنَا تارِكٌ فِيكُمْ ثقَلَيْنِ: أوَّلُهُمَا كِتابُ اللَّهِ، فِيهِ الهُدَى وَالنُّورُ، فخُذُوا بِكِتابِ اللَّهِ وَاسْتمْسِكُوا بِهِ فحَثَّ عَلَى كِتابِ اللَّهِ وَرَغَّبَ فِيهِ، ثمَّ قالَ: وَأهْلُ بَيْتِي، أذَكِّرُكُمُ اللَّهَ فِي أهْلِ بَيْتِي، ثلاثا) رواه مسلم[1] واتە: من دو شتی سەنگینم لە ناوتاندا جێ هێشتوە، یەکەمیان کتێبەکەی خوایە، کە ڕێنمایی و ڕوناکی تێدایە، دەست بە کتێبەکەی خواوە بگرن و پابەندی بن پاشان فەرموی: بنەماڵەو خێزانم، خۆتان بیر دەهێنمەوە دەربارەی بنەماڵەو خێزانم، سێ جار فەرموی..

هەروەها دەربارەی خۆشویستنی هاوەڵان جنێونەدان پێیان: دەفەرموێت: (اللَّهَ اللَّهَ فِي أصْحَابِي، لَا تتَّخِذُوهُمْ غَرَضًا بَعْدِي، فمَنْ أحَبَّهُمْ فبِحُبِّي أحَبَّهُمْ، وَمَنْ أبْغَضَهُمْ فبِبُغْضِي أبْغَضَهُمْ وَمَنْ آذَاهُمْ فقَدْ آذَانِي، وَمَنْ آذَانِي فقَدْ آذَى اللَّهَ، وَمَنْ آذَى اللَّهَ يُوشِكُ أنْ يَأْخُذَهُ [2]) واتە: الله ! الله ! لە هاوەڵانم، لە دوای من مەیانکەن بە نیشانی تانەوتەشەر. هەرکەس خۆشی بوێن ئەوە لە خۆشەویستی منەوە خۆشی دەوێن هەرکەس ڕقی لێیان بێت ئەوە لە ڕقی من ڕقی لێیانە، هەرکەس ئازاریان بدات ئەوە منی ئازار داوە، هەرکەس من ئازار بدات ئەوە خوای ئازار داوە، هەرکەس خوا ئازار بدات ئەوا نزیکە خەشمی لێ بگرێت .

هەروەها دەفەرموێ: (مَنْ سبَّ أصحابي فعليه لعنة الله و الملائكة والناس أجمعين)رواه الطبراني وقال الالباني صحيح. واتە: هەرکەسێ جنێو بە هاوەڵانم بدات، نەفرەتی خواو فریشتەکان و هەمو خەڵکی لەسەر بێت.

---

١ ـ موسلیم (٤٤٢٥)، ترمزی (٣٧٨٨)، ئیمامی ئەحمەد (١٨٤٦٤) و شێخی ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢٤٥٨)دا دەڵێ: سەحیحە.

٢ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە: (رواه الترمذي واحمد ، وهو في العقيدة الطحاوية)، ئەمەش ژمارەو شوێنی ترمزی (٣٨٦٢)، ئەحمەد (٨٧/٤)، بەیهیقی (١٩١/٢).

**٢ ) شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی کردن:**

**خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ...﴾ النســـاء/٥٩ واتـــە: ئـــەی ئەوانـــەی ئیمانتـــان هێنـــاوە گوێڕایـــەڵی خـــواو گوێڕایـــەڵی پێغەمبـــەرو کاربەدەستانی خۆتان بکەن، ئەگەر لە شتێکدا کێشەتان هەبو بیگێڕنـەوە بـۆ لای خـواو پێغەمبـەر... هـەروەها بـە پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ﴾ال عمران/٣١ واتـە: بڵـێ: ئەگـەر ئێـوە خواتـان خـۆش دەوێـت، ئـەوا شـوێنم بکـەون خـواش ئێـوەی خـۆش دەوێـت. پێغەمبـەریش صـلی الله علیـە وسـلم دەفـەرموێت: (مَـنْ أطَاعَنِي فقَدْ أطاع اللهَ، وَمَنْ عَصَانِي فقَدْ عَصَى اللهَ) رواه البخـاري ومسـلم[١] واتە: هەرکەس گوێڕایەڵیم بکات، ئەوا گوێڕایەڵی خوای کـردوە، هەرکـەس سەرپێچیم بکات، ئەوا سەرپێچی خوای کردوە .**

**٣ ) درودو سەڵاوات دان لەسەری:**

**خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾الاحزاب/٥٦ واتە: خواو فریشتەکانی درود لەســەر پێغەمبــەر دەدەن، ئــەی ئەوانــەی ئیمانتــان هێنــاوە درودو ســڵاوی لەســـەر بـــدەن . هـــەروەها پێغەمبـــەر صـــلی الله علیـــە وســـلم دەفـەرموێت: (... وَصَلُوا عَلَيَّ، فإنَّ صَلَاتكُمْ تـبلغني حَيـثُ كُنتـم)رواه ابـو داود باسـناد حسـن[٢] واتـە: درودم لەسـەر بـدەن، چـونکە درودەکانتـانم پـێ دەگات لە هەر کوێیەك بن.**

---

١ـ بوخاری (٧١٣٧) ، موسلیم (١٨٣٧) ، ئەبوداود (٢٧٠٠)، نەسائی (٨٦٧٥) .

٢ـ ئەبوداود(٢٠٤٢)، شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە (صحيح الجامع ٧٢٢٦).

# پاشکۆ

## کاریگەریی ئیمانبون بە پێغەمبەران لەسەر ژیانی موسوڵمان

أ - زانینی ڕادەی گرنگیدانی خوای گەورە بە بەندەکانی، کەوا سەرمەشق و ڕێ نیشاندەری بۆ ڕەوانە کردون، تاکو سەرگەردان و گومڕا نەبن، هەروەها سوپاس گوزاری دەربڕین بۆ خوا لەسەر بەهرەو بەخشینەکانی.

ب - هەڵبژاردن و بە یاد کردنی کەسایەتی بێ وێنە و بڵند لەسەرجەم بوارەکانی ژیانداو شوێن کەوتن و چاو لێکردنی و دانانی بەسەر چاوەی وەرگرتن و ئاڕاستە.

ج - جیاکردنەوەی بەرەی چاکەکار و تاوانبارو هەڵاوێردنی سەنگەری ڕەواو ناڕەواو شوێن کەوتنی کاروانی موسوڵمانان و پەرێز کردن لە پێڕی شەیتان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾النساء/٦٩ واتە: هەرکەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوا لەگەڵ ئەوانەدایە، کە خوای گەورە بەهرەی بەسەردا ڕشتون، لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئەوانەش باشترین هاودەنگ و هاوڕێن.

# پایەی پێنجەم

## ئیمان هێنان بە رۆژی دوایی

بەندی یەکەم: پێشەکی و دەسپێکی رۆژی دوایی

- باسی یەکەم: نیشانەکانی هاتنی رۆژی دوایی .

* نیشانە بچوکەکان .

* نیشانە گەورەکان .

- باسی دوەم: تێکچونی ژیان و بونەوەر .

بەندی دوەم: ئیمانهێنان بەو بەسەرهاتانەی لە دوای مردن رو دەدەن

- باسی یەکەم: گیان کێشان .

- باسی دوەم: تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ.

- باسی سێیەم: مەینەتی ناو گۆڕ .

بەندی سێیەم: ئیمانهێنان بە زیندو بونەوە

- باسی یەکەم: کات و شێوەی زیندو بونەوە.

- باسی دوەم: بەڵگەکانی زیندوبونەوە .

بەندی چوارەم: ئیمانهێنان بە حەشرو کۆبونەوە

- باسی یەکەم: شوێنی حەشرو کۆبونەوە .

- باسی دوەم: بارودۆخی رۆژی حەشر .

- باسی سێیەم: تکاکاری پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم .

بەندی پێنجەم: ئیمانهێنان بە لێپرسینەوەو پاداشت.

ـ باسی یەکەم: نمایش کرانی بەندەکان.

ـ باسی دوەم: لێپرسینەوەو دادگایی کران.

ـ باسی سێیەم: تەرازو نامەی کردەوەکان.

بەندی شەشەم: ئیمانهێنان بە حەوزی کەوسەر

بەندی حەوتەم: ئیمانهێنان بە پردی سیرات

بەندی هەشتەم: ئیمانهێنان بە بەهەشت و دۆزەخ

ـ باسی یەکەم: بەهەشت.

ـ باسی دووەم: دۆزەخ.

* گرنگی ئیمانهێنان بە رۆژی دوایی.

## پایەی پێنجەم: ئیمانهێنان بەڕۆژی دوایی

ڕۆژی دوایی: ئەو ڕۆژەیە، کە خەڵکی تێدا بۆ لێپرسینەوەو پاداشت وەرگرتن زیندو دەکرێتەوە، دوا ڕۆژو سەرئەنجامەو هیچ ڕۆژێکی تری بە دوادا نایەت.

ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی: واتە ئیمانهێنان بە سەرجەم ئەو هەواڵانەی، کە خوای گەورە لە کتێبەکەیداو پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لە فەرمودە کانیدا پێیان ڕاگەیاندون، دەربارەی ئەو کارەسات و بەسەرهاتەی لە دوای مردن و کۆتایی هاتنی ژیانی دنیا ڕو دەدەن.

ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

## بەندی یەکەم: باوەڕهێنان بەو کارەساتانەی کە لە پێش و سەرەتای ڕۆژی دواییین.

ئەو کارەساتانەش دو بەشن:

ا- نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

ب- تێك چونی ژیان و بونەوەر.

### باسی یەکەم: نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی

کات و سەردەمی هاتنی ڕۆژی دوایی نەزانراوە، کەسیش جگە لە خوای گەورە نازانێت چۆن وکەی ڕو دەدات، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ

ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾الأعراف/١٨٧ واتە: ئەی موحەمەد صلی الله علیه وسلم پرسیارت دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی لێ دەکەن، ئایا کەی ڕو دەدات؟ بڵێ: زانیارییەکەی تەنها لای پەروەردگارمە، هیچ کەس ئاگای بەسەر کاتەکەیدا نییەتەنها خۆی نەبێت، ڕودانی قیامەت کارەساتێکی گەورەو گرانە لە ئاسمانەکان و زەویدا، لە پڕ نەبێت بەسەرتاندا نایەت، لە تۆ دەپرسن وەك ئەوەی تۆ لێی بکۆڵیتەوەو زانیاریت پێی هەبێت: بڵێ: زانیارییەکەی تەنها لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن . ئنجا هەرچەندە کاتی هاتن و ڕودانی ڕۆژی دوایی نەزانراوە، بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نیشانەکانی هاتنی ئەو ڕۆژەی بۆ ڕون کردوینەتەوە، تاکو لە نزیکی ڕودانی و ڕاستیەتی هاتنی دڵنیا بین و ئەو نیشانانە ببنە مەشخەڵ و بەرچاومان ڕون بکەنەوەو ئاسۆمان بۆ دەرخەن، هەر وەك ڕێبوارێك بە نیازە بڕوات بۆ شارێکی ترو ناونیشانەکەی لە کەسانی شارەزا وەردەگرێت، ئنجا کاتێك لێی نزیك دەبێتەوە بە ناونیشانەکەیدا، دەزانێت کام ڕێگاو کام گوند و چ شاخ و چ مەزرایەکی لێ نزیکەو دەیان ناسێتەوە، ئەوسا دڵنیا دەبێت، کە بێ سێ و دو ئاڕاستەی بەرەو ئەو شارەیە، کە بۆی دەڕوات و لێی نزیك بوەتەوە. نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکرێن بە دو بەشەوە:

# نیشانە بچوکەکان

## نیشانە بچوکەکانیش دەکرێن بە سێ بەشەوە:

یەکەم: ئەوانەی ڕویان داوەو بەسەر چون: دیارترینیان ئەمانەن:

١- ڕەوانە کران و کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم: وەك دەربارەی ڕەوانە کرانی دەفەرموێت: (بُعِثتُ أنَا وَالسَّاعَةِ كَهَاتينِ، قالَ: وضَمَّ السَّبَّابَةَ و الوسطى)رواه البخاري و مسلم[1] واتە: من بە پێغەمبەرێتیەوە رەوانە کراوم و لەگەڵ هاتنی ڕۆژی دوایی دا وەك ئەم دوانە واین. ڕاوی فەرمودەکە دەفەرموێ: پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی پێکەوە جوت کرد. پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم مەبەستی ئەوەیە لە نێوانی ڕەوانە کرانی ئەو هاتنی ڕۆژی دوایی دا پێغەمبەری تر ڕەوانە ناکرێت و ڕۆژی دوایی نزیکە وەك نزیکی ئەو دو پەنجەیە لە یەکەوە، هەروەها دەربارەی کۆچی دوایی کردنی صلی الله علیە وسلم.

دەفەرموێت: (أعدَدتَ سِتاً بَينَ يَدَي السَّاعَةِ ... مَوتي)رواه البخاري[2] واتە: لە پێش هاتنی قیامەتدا شەش نیشانەم ژماردوە... مردنم... لێرەدا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم مردنی خۆی بە یەکێك لەو نیشانانە داناوە.

دووەم: لەت بونی مانگ: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ القمر/١ واتە: قیامەت نزیك بۆتەوەو مانگ لەت بو.

ئەنەسی کوڕی مالك ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە: خەڵکی مەککە

---

١- بوخاری (٣٤٧/١١ ژ ٦٥٠٣) ، موسلیم (٨٩/١٨ ژ ٢٩٥٠) .

٢ - بوخاری (٣١٧٦).

داوایان لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کرد، کە نیشانەیەکی پێغەمبەرایەتییان نیشان بدات، پێغەمبەریش صلی الله علیە وسلم مانگی بە دو کەرتی نیشان دان، سەیریان کرد شاخی (حیڕاء) کەوتوەتە نێوانیان بخاری و مسلم گێڕاویەتیانەوە.[١].

سێ یەم: دەرچونی ئاگر لە حیجازەوە: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەربارەی دەرچونی ئەو ئاگرە دەفەرموێت: (لَا تقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تخرُجَ نَارٌ مِنْ أرضِ الحِجَازِ تضِيءُ أعنَاقَ الإبِلِ ببُصرَى) بوخاری[٢] واتە: قیامەت نایەت هەتا ئاگرێك لە خاکی حیجازەوە دەردەچێت، گەردنی حوشتر لە بوسرا (لە شامە)ڕۆشن دەکاتەوە . ئەو ئاگرە لە نیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی لە ساڵی ٦٥٤دا کەوتوەتەوەو زۆر لەو دەشتەکییانەی لە نزیکی بوسرا نیشتە جێ بون بینیویانە، لەوێ گەردنی حوشتری ڕوناك کردوەتەوە، هەر وەك ئیمامان ئیبنو کەثیرو نەوەوی و قورتوبی باسیان کردوە .

ب ـ ئەوانەی ڕویان داوەو ڕەنگە ڕوش بدەنەوە:

نمونەی ئەم نیشانانە زۆرن، بەڵام لێرەدا هەندێکیان باس دەکەین، کە ئەمانەن:

١) ڕزگار کردنی شاری قودس (بیت المقدس): پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێت: (أعدَدتُ سِتاً بَينَ يَدَي السَّاعَةِ.. فَذكَرَ مِنهَا: فَتحُ بَيتِ المَقدِسِ)رواه البخاري[٣] واتە: لە پێش هاتنی قیامەتدا شەش نیشانەم ژماردوە ؛ لەوانە باسی ڕزگار کردنی بەیتولمەقدیسی کرد. کە بۆ جاری یەکەم لە ساڵی ١٦ ی کۆچی و لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا

١ ـ موسلیم (٢٨٠٠).
٢ ـ بوخاری (٧١١٨ )
٣ ـ موسلیم (٢٨٠٠).

عومەری کوڕی خەتتابدا خوا لێی ڕازی بێت ڕزگار کرا؛ پاشان بۆ جاری دوەم لە ساڵی ٥٨٣ی کۆچی و لەسەر دەستی سوڵتان سەلاحەددینی ئەییوبی رەحمەتیدا ڕزگارکرایەوە.

٢) شوێن کەوتنی ڕەویەو ڕەفتاری ئوممەتە پێشوەکان: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: ( لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَأْخُذَ أُمَّتِي بِأَخْذِ الْقُرُونِ قَبْلَهَا شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَفَارِسَ وَالرُّومِ فَقَالَ وَمَنَ النَّاسُ إِلَّا أُولَئِكَ)رواه البخاري ومسلم[١] واته: قیامەت هەڵناستێت هەتا ئوممەتەکەم شوێن پێ ی ئوممەتەکانی پێش خۆی بست بە بست گەز بە گەز هەڵنەگرێت! وتیان ئەی پێغەمبەر خوا مەبەستت لە خەڵکی فارس ورۆمەکانە ؟ فەرموی ئەی خەڵکی تر کێ هەیە بێجگە لەوان ؟) لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ؛ مەبەستت جولەکەو دیانەکانە ؟ فەرموی: (ئەی کێ؟).

٣) وون کردنی ڕاسپاردە (الأمانة): پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ قَالَ كَيْفَ إِضَاعَتُهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ إِذَا أُسْنِدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ) رواه البخاري[٢] واتە: ئەگەر ڕاسپاردە بزر کرا، ئەوا چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی بە. یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بزر دەکرێت؟ فەرموی: ئەگەر کاروبار درایە دەست کەسی نەشیاو، چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی دوایی بە.

ج ـ ئەوانەی هێشتا ڕویان نەداوە: ئەمانیش زۆرن؛ وەك:

١) هەڵئاوسانی مانگ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مِن

---

١ ـ فتح الباري شەرحی بوخاری (٣١٢/١٣ ژ.٧٣٢٠).
٢ ـ بوخاری (٥٩ و ٦١٣١)،

اقْتِـرَابِ السَّـاعَةِ انْتِفَـاخُ الأهِلَّـةِ )[١]: واتــە: لـە نیشـانەكانی نزیكـی قیامـەت هەڵئاوسانی مانگە. مەبەست لەوەیە: دەركەوتنی لە یـەك شـەوەدا وەك دو شەوە وایە .

٢) فورات و دەرخستنی شاخێكی ئاڵتونی: پێغەمبەری سەروەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِـنْ ذَهَبٍ يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْـهِ فَيُقْتَـلُ مِـنْ كُلِّ مِائَـةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ لَعَلِّي أَكُونُ أَنَا الَّذِي أَنْجُو) رواه البخـاري ومسـلم[٢] واتـە: قیامـەت هەڵناستێت، هەتا فورات شاخێكی ئاڵتون دەرنەخات، خەڵكی شەڕی لەسەر دەكەن و لە هەر سەد كەسیان نـەوەدو نۆیـان دەكوژرێن، هـەر پیاوێكیـان دەڵێت، بەڵكو من ئەو كەسە بم، كە دەرباز دەبم.

٣) كوشـتار لەگـەڵ جولەكـەدا: پێغەمبــەر صـلى الله عليــه وسـلم لــەم بارەیەوە هەواڵمان پێ دەدات و دەفەرموێت: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّـى يُقَاتِـلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِـئَ الْيَهُـودِيُّ مِـنْ وَرَاءِ الْحَجَـرِ أَوْ الشَّجَرِ فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوْ الشَّجَرُ يَا مُسْلِمُ يَـا عَبْـدَ اللَّـهِ هَـذَا يَهُـودِيٌّ خَلْفِـي فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ، إِلَّا الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ) رواه البخاري و مسلم[٣] واتــە: قیامـەت هەڵناسـتێت، هـەتا موسوڵمانان شـەڕ لەگـەڵ جولەكـەدا نەكـەن و موسوڵمانان دەست بە كوشتاریان دەكـەن، هـەتا جولەكـە لـە پشـت بـەرد و دارەوە خۆی حەشار دەدات و بەردو دارەكـە دەڵێن: ئـەی موسـوڵمان، ئـەی بەندەی خوا، ئەمە ئەمە جولەكەیەكە لە پشتمەوە، دە وەرە بیكوژە، تەنها -غرقد- نەبێت، چونكە لە درەختی جولەكەیە.

١ ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە (رواه الطبراني في الكبير و قال الألباني: صـحيح) راسـتە ئەمە لای تەبەرانیە لە (الاوسط ١٠/١٩٨)شێخی ئەلبانی رەحمەتی لە زۆر توێژینەوەیدا گوتویـەتی، كـە سەحیحە (سلسلة الاحاديث الصحيحة ٥/٣٦٦ ژ.٢٢٩٢).

٢ ـ بوخاری (٧١١٩)، موسلیم (٧٢٧٢).

٣ ـ بوخاری (٢٩٢٦ ، فتح الباری ٦/١٠٣)، موسلیم (٤/٢٢٣٨) .

# نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەفەرمودەی صحیح دا ئاماژەی بۆ (دە) نیشانەی گەورە کردوە، هەروەك حوزەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (اطلَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ فَقَالَ مَا تَذَاكَرُونَ قَالُوا نَذْكُرُ السَّاعَةَ قَالَ إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ فَذَكَرَ الدُّخَانَ وَالدَّجَّالَ وَالدَّابَّةَ وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ الْيَمَنِ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ)رواه مسلم[1] واتە: پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم لێ دەرکەوت، لەوکاتەدا ئێمە لە باسکردن دا بوین، فەرموی: باسی چی دەکەن؟ وتمان: باسی ڕۆژی دوای دەکەین، فەرموی: قیامەت هەڵناستێت، هەتا لەپێشیەوە دە نیشانە نەبینن، ئنجا باسی (دوکەڵ و دەججال و ئاژەڵەکەو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوەو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم ویەئجوج و مەئجوج وسێ ڕۆچونەکان: ڕۆچونێك لە ڕۆژهەڵات و ڕۆچونێك لە ڕۆژئاوا و ڕۆچونێك لە نیوە دورگەی عەرەب، دواهەمینیان ئاگرێکە لە یەمەنەوە دەردەچێت وخەڵکی بەرەو شوێنی کۆبونەوەیان ڕاپێچ دەکات). هەروەها دەربارەی بەدوای یەکدا هاتنی ئەم نیشانانە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (الآيَاتُ خَرَزَاتٌ مَنظُومَاتٌ في سِلْكٍ، فإن يُقطَعْ

---

١ ـ موسلیم (٢٩٠١ و ٥١٦٣) .

السِّلْكُ، يَتبَعُ بعْضُهَا بَعْضاً)[1] واتە: نیشانەکان وەك موروی هۆنراوە وان، کە بەڕشتەیەکەوە بن، ئەگەر ڕشتەکە بچرا یەك بەدواییەك هەڵدەوەرێت، با بەکورتی باسیان بکەین:

**یەکەم: سەرهەڵدانی مەسیحی دەججال**

یەکێك لەنیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، دەرکەوتنی پیاوێکە لەشارێکی ڕۆژهەڵاتەوە پێ ی دەوترێت (خۆراسان)و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە(دەججال) واتە ساختەچی ناوی بردوە.

دەججال گەنجێکی سورکاری چوار شانەی قژ لولی گێڕی ملپانی نەزۆکە و چاوی ڕاستی کوێرە چاوی چەپی تانەی لەسەرەو لە نێو چاوانی بەپیتی جیا جیا نوسراوە(کافر)[2] واتە: (ك، ف، ر) هەمو ئیمانداریکی خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێت بیخوێنێتەوە، دەججال بابایەکی ساختەچی و فێڵبازە و بانگەشەی خوایەتی دەکات، خوای گەورەش بۆ ئەوەی بەندەکانی تاقی بکاتەوە توانای زۆری پێداوە، کە بەهۆیانەوە خەڵکێکی زۆر فریو دەدات، بۆ نمونە: وەك هەور کە با ڕای فڕێنێ تیژوخێرا دەڕوات ودەگاتە هەمو شارو ناوچەیەك تەنها مەککەو مەدینە نەبێت، هەروەها بەهەشت و ئاگر یاخود- ڕوبارێکی ئاوی سپی و ڕوبارێکی ئاگری بڵێسەداری، پێیەو بەهەشتەکەی ئاگرەو ئاگرەکەی بەهەشتە، ئنجا شەیتان و دەست وپێوەندەکانی یارمەتی دەدەن، کاتێك دەججال دەڵێ مردو زیندو دەکەمەوە، ئەمان خۆیان دەخەنە سەر شێوەی مردوەکە، هەروەها ئاژەڵ وگیانداران بەدەمیەوە دێن وشوێنی دەکەون، فەرمان دەکات باران دەبارێت وگژوگیا دەڕوێت، خەڵکێکی زۆر لە عەجەم وتورك

---

١ ـ ئیمامی ئەحمەد گێڕاوێتیەوەو شێخ ئەحمەد شاکری دەڵێ سەحیحە.

٢ـ موسلیم (٢٩٣٣)، ئەبوداود (٣٤١٦و ٣٤١٨)، ترمزی (٢٢٤٦).

ودەشتەکی شوێنی دەکەون و زۆربەیان جولەکەو ئافرەتن، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِنّي لأُنذِرُكُمُوهُ وَمَا مِنْ نَبِيّ إِلَّا أَنذَرَهُ قَوْمَهُ لَقَدْ أَنذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ وَلَكِنّي أَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلًا لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)رواه البخاري[1] واتە: من ئاگادارتان ئەکەمەوە لە دەججال و هیچ پێغەمبەرێك نییەگەلەکەی لێ ئاگادار نەکردبێتەوە، بەڵام من قسەیەکتان دەربارەی پێ دەڵێم، کە هیچ پێغەمبەرێك نەی وتبێت دەججال کوێرە، بەڵام خوای گەورە کوێر نییە.. هەروەها دەربارەی مانەوەی دەججال لەسەر زەوی پرسیاریان لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرد:(وَمَالَبْثُهُ فِي الأَرْضِ ؟)واتە: مانەوەی لەسەر زەوی چەندە ؟ فەرموی: (أَرْبَعُونَ يَوماً، يَومٌ كَسَنَةٍ، وَيَومٌ كَشَهْرٍ، وَيَومٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ..)رواه مسلم وابوداود[2] واتە: چل ڕۆژە، ڕۆژێکیان وەك ساڵێکەو ڕۆژێکیان وەك مانگێکە ڕۆژێکیان وەك هەفتەیەکە، سەرجەم ڕۆژەکانی تری وەك ڕۆژەکانی ئێوە وایە[3].

**چۆنیەتی خۆ پاراستن لەدەججال:**

١) لەبەرکردنی (دە) ئایەتی سەرەتای سورەتی (کەهف)، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ (الكهف)عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ) رواه مسلم[4] واتە: هەرکەس دە

---

١ ـ بوخاری (١٢٨٩ و ٥٨٢١) ..

٢ ـ موسلیم (٢٩٣٧)، ئەبوداود (٤٣٢١ ، ٤٣٢٢)، ترمزی (٢٢٤١).

٣ ـ باسی دەججال لە سەرچاوەکانی فەرمودەدا زۆر هاتوە، لە هەموشیان راستتر ریوایەتەکانی بوخاری و موسلیم و ئەوانەی تر، کە فەرمودەوانانی بەرجەستە توێژینەوەیان لەسەر کردوە. وەك (بوخاری/ الفتن (٧١٣٠)، موسلیم/ الفتن (٢٩٣٥).

٤ موسلیم (٨٠٩).

ئایــەتی ســەرەتای ســورەتی (الكهــف) لەبــەر بکــات، لــە فیتنــەی دەججـال پارێزراو دەبێت..

٢) خوێندنی نزای تایبـەت بـەو، واتـە وتـنی: (اللَّهُمَّ إِنّـي أعُـوذُ بِـك مِـنْ عَذابِ القَبْرِ، وأعُوذُ بِـكَ مِنْ فِتنَـةِ المَسِيحِ الـدَّجَّالِ)رواه البخـاری ومسلم[1]. واتە: خوایـە گیـان پـەنا ئـەگرم بـە تـۆ لەسـزای گـۆڕ، پـەنات پێـدەگرم لـە فیتنەی مەسیحی ساختەچی.

٣) ڕاکـردن و دورکەوتنـەوە و خۆکـەنار گیرکـردن لـە دەججـال، چونکە پێغەمبـەر صـلى الله علیـە وسـلم دەفـەرموێت: (مَـنْ سَمِعَ بِالـدَّجَّالِ، فَلْيَنْـأَ عَنْهُ..)[2] واتە: هەر کەس بیستی دەججال هاتوە باخۆی لێ کەنار بگرێت...

٤) پابەند بون بە ئیسلام و خـۆ تـەییار کـردن بـە ئیمـانو زانـینی نـاوو سیفەتەکانی خوای گەورە، چونکە دەججال بەبانگەشەی خوایەتی خـەڵکی لەخشتە دەبات، بەڵام کەسێك بە ڕاستی خـوای گـەورە بناسـێت، ناکەوێتـە داوی تەڵەکە بازی واوە.

**دووەم: دەرکەوتنی مەهدی**

مەهدی: پیاوێکی خواناسـەو نـاوی (محمـد)ی کوڕی (عبداللـه) یـەو لـە بنەماڵەی پێغەمبەرە صلى الله علیه وسلم، لەوەچـەی (فاطمـة)ی کچیەتی خوا لێی ڕازی بێت، لـە کۆتـایی دنیـادا لـە لای ڕۆژهەڵاتـەوە دەردەکـەوێت،

---

١ ـ بوخاری (١٣٧٧)، موسلیم (٥٨٩).

٢ ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە (رواه احمد وابوداود والحاكم ،وهـو صـحيح) بـۆ زیـاتر: لای ئەبوداود (٣٧٦٢) ، لەلای ئیمامی ئەحمەد (١٩١١٨) ، حاکم (٥٤١/٤) هـاتوە. ئـەوەی فەرمویـەتی سەحیحە شێخی ئەلبانیە رحمـه اللـه، کـە لـە توێژینـەوەی (صـحيح أبـي داود ٤٣١٩) دا بـە سـەحیحی ناساندوە .

خوای گەورە بەهۆیەوە ئیسلام سەردەخات وحەوت ساڵ، یان هەشت ساڵ دەسەڵاتدارێتی دەکات وزەوی پڕ دەکات لە دادگەری. لەسەردەمی ئەودا بەهرەو نیعمەتی زۆر بەسەر خەڵکیدا دەڕژێت، باران زۆر دەبارێت و ڕوەك و شینایی زەوی دادەپۆشن و ماڵ وسامانی زۆر وبێ شومار دەستی خەڵکی دەکەوێت، لەکاتی هاتنی دەججال دا موسوڵمانان (مەهدی)دەکەن بە پێشەواو خۆیان لە شام ئامادە دەکەن بۆ ڕوبەڕوبونەوەی دەججال.

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی مەهدی دەفەرموێت: (المهدي مِنّا أهْلِ الْبَيتِ، يُصلِحُهُ اللهُ في ليلةٍ) واتە: مەهدی لەبنەماڵەی ئێمەیە، خوای گەورە لەشەوێك دا چاکی بۆ دەکات. واتە: تەوبەی گیرا دەکات و چاودێری وڕێنمای دەکات. هەروەها دەفەرموێت: (يَخرُجُ فِي آخِرِ أمّتِي المهدي، يُسقِيهِ اللهُ الْغَيثَ، وَتخرُجُ الأرضَ نَبَاتها، وَيُعْطِي المالَ صِحَاحاً، وَتكْثُرُ الماشيةُ، وَتعْظُمُ الأمَةُ، يَعِيشُ سَبْعاً أو ثمانِياً (يَعْنِي حِجَجاً )[1] واتە: لە دواینی ئوممەتەکەم دا مەهدی دەردەکەوێت، خوای گەورە بارانی زۆر دەبارێنێ وزەوی ڕوەکی لێ دەڕوێت وماڵ و دارای بەیەکسانی بەسەر خەڵکی دا دابەش دەکات، ئاژەڵ زۆر دەبێت و ئوممەتی ئیسلام پەرەدەسێنێت، حەوت یان هەشت ساڵ دەژی[2]..

---

١ - (رواه الحاكم وهو في الصحيحة، وقال الألباني: هذا سند صحيح رجاله ثقات ).

٢ - بەڵگە لەسەر هاتنی مەهدی زۆر زۆرە، بەڵام بە داخەوە هەندێك موسوڵمانی ساویلکە لە رقی شیعە، یان لە نەزانینی خۆیانەوە نکوڵی لێ دەکەن.. هەرچەندە ئێرە شوێنی موناقەشەی ئەوە نیە، بەڵام دەتوانرێت بەڵگەکان لەم شوێنانەدا بخوێندرێت: (شێخی ئەلبانی: (صحيح الترمذي – ٢٢٣٢، صحيح ابن ماجه ٣٣١٥، ٣٣١٦، صحيح أبي داود٤٢٨٤، ٤٢٨٥، السلسلة الصحيحة ٧١١، ٢٣٧١، ٢٢٣٦، صحيح الجامع ٦٧٣٤، مشكاة المصابيح ٥٣٨١، ٥٣٨٢).. ئەمە هەندێك لە توێژینەوەکانی شێخی ئەلبانیە و دەیان باسی تری مەهدی لای ئیمامی ئیبنو حەجەر لە (هداية الرواة) ، ئیمامی ئیبنوتەیمییە لە (منهاج السنة) و ئیبنولقەییم لە (المنار المنيف) و ئیبنو کەسیر لە (البداية و النهاية) و ئیمامی زەهەبی لە (سير اعلام النبلاء) و ئەوانی تر هەیە... بەحسێکی ماستەریش لە زانکۆی ئیسلامی

**سێ یەم: دابەزینی سەیدنا عیسای کوڕی مەریەم**

سەیدنا (عیسا) علیه السلام پیاوێکی چوار شانەی بەژن مام ناوەندی سورکاری قژ لولەو سنگی پانەو هەمیشە دەڵێیت لەگەرماو (حەمام) هاتۆتە دەرەوە و قژی ئاوی لێ دەتکێت، خوای گەورە پاش ئەوەی ڕەوانەی کرد بۆ لای میللەتی (بەنوئیسرائیل) و ئەرکی خۆی بە ئەنجام گەیاند بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان، هەر وەك لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ النساء/١٥٧-١٥٨ واتە جولەکەکان بەدڵنیایی نەیان کوشتوە، بەڵکو خوا بەرزی کردۆتەوە بۆلای خۆی، هەرخوایە کەشکۆمەندو کار بەجێیە.

ئنجا کاتێك دەججال سەر هەڵ دەدات ولە زەویدا خراپەکاری بەرپا دەکات، خوای گەورە عیسا علیه السلام دادە بەزێنێتەوە سەرزەوی، لەلای منارە سپی (المنارة البيضاء)لە ڕۆژهەلاتی دیمەشق لە شامەوە، بەسەر ئەو تاقمە ئیمانداریەدا دادە بەزێت، کە خۆیان بۆ کوشتاری دەججال ڕێك خستوە ومەهدیان کردوە بە فەرماندەی خۆیان، لەوکاتە دا قامەت دەکە ن بۆ نوێژ ولە دوای مەهدییەوە نوێژ دەکات، پاشان عیسا علیه السلام پێش ئەوکۆمەڵە دەکەوێت بە مەبەستی کوشتنی دەججال، کە لەوکاتەدا دەججال بەرەو (بيت المقدس) دەڕوات و لەلای دەروازەی شارۆچکەی لودد (کە لە فەلەستینە)پێیدەگات، هەر کە (دەججال) چاوی بە سەیدنا عیسا علیه السلام دەکەوێت، وەك خوێی ناو ئاو دەتوێتەوە و عیسا علیه السلام پێی دەفەرموێت: هەر ئەبێ گورزێکت لێ بدەم ولە دەستم دەرناچیت،

---

مەدینە لەسەر مەهدی هەیە، کە گشتگیرەو بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە، کە بە چاوی گومانەوە بۆ بەڵگەکان دەڕوانن...

ئنجا بـە نێزەکـەی خـۆی دەیکوژێـت و شـوێنکەوتوانی دەججـال دەبـەزن و ئیمانـداران شـوێنیان دەکـەون و دەسـت بەکوشـتاریان دەکـەن، ئەمـە ئـەو ڕۆژەیە، کە دارو بەردیان لێ دێتە زمان ودەڵێن: (يا مُسلِمُ ! يَا عَبْدَاللهِ! هذا يَهودِيٌّ خَلفِي، فتعَالَ، فاقتلهُ )[1].

سـەیدنا عیسـا علیـە السـلام چـل سـاڵ لەسـەر زەوی دەمێنێتـەوە و بەشەریعەتی (محمد)صلی الله علیـە وسلم حـوکم دەکات و دادگـەری بڵاو دەکاتەوەو سەرانە ناهێڵێ و لەسەردەمیدا ماڵ و سـامان زۆردەبێـت، پاشـان کۆچی دوایی دەکات و موسڵمانان نوێـژی لەسـەر دەکـەن. پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (يَنزِلُ عيسى بنُ مَريَمَ، فيقولُ أميرُهُم المهديُّ: تعَالَ صَلِّ بنَـا، فيقـولُ: لا، إنَّ بَعْضَهُم أمـيرُ بَعْضٍ تكرِمَـةُ اللهِ لِهَـذهِ الأمَّـةِ )[2] واتـە: عیسـای کـوری مەریـەم دادەبـەزێت، فەرمانـدەی ئیمانـداران، کـە مەهدییـە بـە عیسـا دەفـەرموێت: فـەرمو وەرە پـێش نوێـژیمان بـۆ بکـە دەفەرموێت: نا، ئیماندارانی ئێوە (موسوڵمانانی شوێن کەوتوی محمد صلی الله علیه وسلم) لـە نـاو خۆیانـدا ئـەمیر هەڵدەبـژێرن، ئەمـە ڕێـزی خـوای گەورەیە بۆ ئەم ئوممەتە..

---

١ ـ بوخاری (٢٩٢٦ ، فتح الباری ١٠٣/٦) ، موسلیم (٢٢٣٨/٤) .

٢ ـ نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: (رواه الحارث بن أبي أسامة في مسنده بإسناد جيد كما قال ابن القيم في المنار المنيف والسيوطي في الحاوى وقال ابن القيم:هذا إسناد جيد ، وصحح عبدالعليم في رسالته فى المهدي) .. وا دیارە نوسەری بەڕێز ئەم پـەراوێزەی لـە شـوێنێکەوە نـەقڵ کردبێـت، نـازانم ئـاخۆ مەبەسـتی لـەو عبدالعەزیمـە دکتـۆر عبدالعـەلیم عەبدولعـەزیمی بەسـتەوییە خـاوەنی کتـێبی (الاحاديث الواردة في المهدي في ميزان الجرح والتعديل) کە توێژینەوەی فەرمودەکانی مەهدی کردوە یـان کەسـێکی ترە .. بەڵام بە هەر حاڵ فەرمودەی وا بە ریوایاتی تریش لە موسلیم (١٥٦ )دا هەیە کە دەفەرموێ: (لا تزال طائفة من أمتي يقاتلون على الحق ظاهرين إلى يوم القيامة . قال: فينْزِلُ عيسى ابـنُ مـريمَ صـلى الله عليه وسلم ، فيقول أميرهم: تعالَ صَلِّ لنا . فيقول: لا إنّ بعضكم علـى بعـضٍ أمـراءٌ ، تَكْرِمَـةُ الله هـذه الأمَّة)..

هەروەها دەربارەی دەفەرمویت: ( وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلًا فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الْوَاحِدَةُ خَيْرًا مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ) رواه الشيخان[1] واتە: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە زۆری نەماوە (ابن مريم: سەیدنا عیسا) وەك فەرمانڕەوایەکی دادگەر لەناوتاندا دابەزێت وخاچ بشکێنێت و بەراز بکوژێت، سەرانە هەڵدەگرێت پێ بێنێت و ماڵ وسامان زۆر بکات، هەتا هیچ کەس وەری نەگرێت، تا وای لێبێت کڕنوشێك چاکتر بێت لە دنیاو لەوەی تێیدایە، دەربارەی مانەوەشی لە زەویدا دەفەرمویت: (فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، ثُمَّ يَتوفى وَيُصَلِّي عَلَيْهِ المسلمونَ )[2] واتە: چل ساڵ لەزەویدا دادەمێنێتەوە، پاشان کۆچی دوایی دەکات وموسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

### چوارەم: هاتنی یەئجوج ومەئجوج

پاش ئەوەی باوەڕداران بە پێشەوایەتی (عیسای کوری مەریەم)سەلامی خوای لێ بێت لە کوشتاری دەججال و شوێن کەوتوانی دەگەڕێنەوە، توشی گەلێك دێن دەم وچاو گرژو چاو بچکۆلە و لوت کورتەڵەن لە نەوەی تاقی کوری نوحن سەلامی خوای لێ بێت، لە هەمو کون و کە لەبەرێکەوە دەردەپەڕن وبەلای دەریاچەی (طبرية)دا تێدەپەڕن، کە دەکەوێتە فەلەستینی ئەمڕۆوە و هەرچی ئاوی تێدایە دەیخۆنەوەو دوایین کەسیان

---

١ ـ بوخاری (٥/١٢١ ژ ٢٢٢٢) ، موسلیم (١٥٥).

٢ ـ نوسەری بەڕێز نوسیویێتی: (رواه احمد وابوداود وقال ابن حجر صحيح .) شێخی ئەلبانیش لە(سلسلة الاحاديث الصحيحة ٢١٨٢) دا گوتویەتی سەحیحە.

دەڵێ: ئای ئەمە کاتێك بوە ئاوی تێدا بوە، هەتا دەگەنە شاخی (خومر) لە بەیتولمەقدیس، دەڵێن: ئەوەی لەسەر زەوی بو کوشتمان، با ئەوەی لە ئاسمانیشە بیکوژین، ئنجا بە تیرەکانیان ئاسمان تیر باران دەکەن و خوای گەورە تیرەکانیان بە خوێن سورکراوی بۆ دەگێڕێتەوە خوارەوە، ئنجا گەمارۆی عیسا پێغەمبەرو هاوەڵانی دەدەن و ئەوانیش لە خوا دەپاڕێنەوە کە بەریان بگرێت، خوای گەورەش کرمێکیان بۆ بەرێ دەکات و وەك خۆرە دەداتە گەردنیان وتێوە دەگلێن و بە وێنەی یەك کەس هەمو بە جارێك گیانیان دەردەچێت و دەمرن و دەشت ودەر پڕدەکەن لە کەلاك و دنیا بۆگەن دەبێت، ئنجا عیسا علیە السلام وهاوەڵەکانی لە خوا دەپاڕێنەوە، کە ئەو بۆگەنەیان لێ دور بخاتەوە، خوای گەورەش باڵندەیەکیان بۆ دەنێرێت کەوەك ملی حوشتر وایە هەڵیان دەگرێت ولە هەر شوێنێك خوای گەورە بیەوێت فڕێ یان دەدات. رواه مسلم.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەربارەی (یەئجوج و مەئجوج) دەفەرموێت: (إذْ أوحَى اللهُ إلى عيسَى: إنّي قدْ أخرَجتُ عِبَاداً لِي لا يُدانُ لأحَدٍ بقِتالِهِم، فاحْرُزْ عِبَادي إلى الطُّورِ . ويبعثُ اللهُ يأجوجَ ومأجوجَ..)رواه مسلم[١] واتە: کاتێك خوای گەورە سروش بۆ عیسا علیە السلام دەکات: ئەوا من کۆمەڵە بەندەیەکم ناردۆتە دەرەوە کە هیچ کەس ناتوانێت بەکوشتار بەرەنگاریان ببێتەوە، بەندەکانم لە کێوی (طور) کەنار بدە، خوای گەورە یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت.

---

١ ـ موسلیم (٢٩٣٧).

**پێنجەم: سەرهەڵدانی گیاندارەکە( الدّابّه )**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾النمل/٨٢ واتە: ئەگەر فەرمانیان لەسەر دەرچو بەهەڕەشەو سزای خوا، ئەوکاتە گیاندارێکی زەوییان بۆ دەردەخەین، کە قسەیان لەگەڵ دەکات، بەڕاستی خەڵکی بەدڵنیاییەوە باوەڕیان بە ئایەتەکانمان نەهێنابو.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی دەرکەوتنی ئەو گیان دارە دەفەرموێت: (تخرُجُ الدَّابَّةُ وَمعَهَا خَاتمُ سُلَيمَانَ وَعَصَا مُوسَى فتجْلُو وَجْهَ المُؤمِنِ وَتخطِمُ أنفَ الكَافِرِ بالخَاتمِ حَتى إنَّ أهْلَ الخِوَانِ ليَجْتمِعُونَ فيَقُولُ هَذا يَا مُؤمِنُ وَهَذا يَا كَافِرُ .. )[١] واتە: گیاندارەکە دەردەکەوێت و داردەستەکەی موسا علیه السلام و مستیلەکەی سلێمانی پێیە علیه السلام ، ئنجا بە مستیلەکە مۆرێك لە لوتی کافر دەدات داردەستەکەی دێنێت بەڕوی ئیماندار، هەتا خەڵکی لەسەر خوانی خواردنیان کۆ دەبنەوەئەمیان دەڵێ: ئەی ئیماندار ئەویان دەڵێ ئەی بێ ئیمان... واتە بەوجۆرە ئیماندارو بێ ئیمان نیشانە دەکرێن و دەناسرێنەوە.

**شەشەم: سێ ڕۆچونەکان**

ئەم ڕۆچونانە نیشانەی گەورەن لە نیشانەکانی نزیك بونەوەی ڕۆژی دوایی جودان لە هەرەس ورۆچونە ئاساییەکانی تری سەرزەویش جیاوازن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە فەرمودەی (صحیح) دا ئاماژەی بۆ کردون وەك دەڵێ: (سَيكونُ بَعْدِي خَسْفٌ بالمَشْرِقِ وخَسْفٌ بالمَغْرِبِ

---

١ ـ نوسەری بەڕێز نوسیویێتی (رواه احمد والترمذي واسناده صحيح .) بۆ زانیاری زیاتر: شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع الصغير ٧١٩ ، ١٦٣٥) دا بە سەحیحی ناساندوە .

وَخَسفٌ بجَزِيرَةِ العَرَبِ) واتە: دوای مـن ڕۆچـونێك لـە ڕۆژهـەلاّت و ڕۆچونێك لـە ڕۆژئـاواو ڕۆچـونێك لـە دورگـەی عـەرەب ڕودەدات.. خـاتو عائیشە خـوای لـێ رازی بێـت دەفـەرموێ: وتم ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئایـا زەوی ڕۆدەچێت لەکاتێکدا پیاو چاکانیشی تێدایە؟ فەرموی: (إذا كَثرَ أهلُهَا الخَبَثُ )[1] واتە: ئەگەر خەڵکەکەی بەزۆری کردەوەی پیسیان هەبو...

**حەوتەم: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە**

خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾الانعام/١٥٨ واتە: ئەوڕۆژەی هەندێ لـە ئایەتـەکانی پـەروەردگارت دێتـە دی، ئەوکاتـە هـیچ نەفسـێك بـاوەڕ هێنانەکـەی سـودی پێناگەیـەنێت، ئەگـەر لەپێشـدا ئیمـانی نـەهێنابێت، یاخود لە ئیمانداریەکەیدا کاری چاکەی بەدەست نەهێنابێت.

زۆربەی زانایانی تەفسیر ڕایان وایە، کە مەبەست لە (بَعضُ آيَاتِ)لەو ئایەتەی سەرەوەدا هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، وەك پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم لە فەرمودەی صحیح دا دەفەرموێت: (لا تقُومُ السَّاعَةُ حَتـى تطلُعَ الشَّمسُ مِنْ مَغرِبِهَا فإذَا طلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَليهَا فذلِكَ حِينَ لَا يَنفعُ نَفسًا إيمَانُهَا لَمْ تكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبلُ أوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيـرًا)رواه الشیخان.[2] واتـە: قیامەت هەڵناستێت هەتا خـۆر لـە خۆرئـاواوە هەڵنەیـەت،

---

١ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە (رواه الترمذي وصححه الشيخ الألباني) ، شێخی ئـەلبانی لە سەحیحی ترمزی و (صحیح الجامع ٢ / ١٣٥٥) دا بـە سـەحیحی ناسـاندوە .. فەرمایشـتی تـری لـەو بەهێزتریش لە سەحیحەیندا هەیە کە لە زەینەبی کچی جەحشەوە هاتوە کە پرسیاری لـە پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه و سلم کردوێتی و فەرمویەتی: (قالَتْ زينبُ بنتُ جَحْشٍ: فَقلتُ: يـا رسـولَ الله: أنَهْلِـكُ وفينا الصَّالِحونَ؟ قالَ: نَعَمْ إذا كَثُرَ الخَبَثُ) بوخاري (٣٣٤٦) ، موسليم (٢٨٨٠).

٢ بوخاری (٤٦٨٠)، موسلیم (٩٥/١ ژ ١٥٧) شەرحی ئیمامی نەوەوی (١٩٥/٢).

ئنجا ئەگەر لەوێوە هەڵهات وخەڵکی بینیان، بە تێکڕا ئیماندەهێنن، ئەوە ئەوکاتەیە، کە هیچ نەفسێك ئیمانهێنانەکەی سودی پێ ناگەیەنێت، ئەگەر لەپێشدا ئیمانی نەهێنابێ، یاخود لە ئیمانداریەکەیدا کاری چاکەی بە دەست نەهێنابێت .

**هەشتەم: دوکەڵ ( الدخان )**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾الدخان/١٠-١١ واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم چاوەڕوانی بەو بێ ئیمانانە بکە بۆ ڕۆژێك، کە ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێت وخەڵکی دادەپۆشێت، دەڵێن: ئەمە سزایەکی بە ئازارە.. عبداللەی کوڕی ئەبی مولەیکە خوا لێی ڕازی بێت: بەیانیەك چوم بۆ لای ئیبنو عەبباس خوای لێ ڕازی بێت گوتی: ئەم شەو هەتا بەیانی خەوم لێ نەکەوتوە، وتم: بۆچی: فەرموی: وتیان: ئەستێرەی کلکدار دەرکەوتوە، ترسام دوکەڵ پەیدا بوبێت، بۆیە تا ڕۆژم کردەوە نەنوستم )[1].

---

١ ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە: (رواه ابن جرير وابن حاتم ، وقال ابن كثير: هذا اسناد صحيح.) .. ئەسڵی فەرمودەکە بەم شێوەیە: (عن بن أبي مُلَيكةَ قال: غَدَوْتُ عَلَى بنِ عباسٍ رضي الله عنهما ذاتَ يومٍ فقال: (مَا نُمْتُ البارِحَةَ حَتَّى أصْبَحْتُ)قُلتُ: لِمَ ؟ قال: قالوا طَلَعَ الكوكَبُ ذو الذَّنَبِ فَخَشِيتُ أنْ يكونَ الدَّجَّالُ قَدْ طَرَقَ) فەرمودەوانان جگە لە بە سەحیح دانانەکەی ئیبنوکەسیر (کە لە تەفسیری سورەتی الدخاندایە لە تەفسیرەکەی خۆیدا )دەربارەی دەڵێن: (صححه الحاكم والذهبي على شرط البخاري ومسلم)..

**نۆیەم: ئەو ئاگرەی خەڵكی بەرەو شوێنی كۆبونەوەیان ڕا پێچ دەكات**

دوایین نیشانەی گەورەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئاگرێكە لە یەمەن و لە تەختی (عەدەن)و لە دەریای (حەزرەمەوت)ەوە سەرهەڵ دەدات، وەك پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم (وآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تخرُجُ مِنَ اليَمَنِ، تطرُدُ النَّاسَ الى مَحشَرِهِمْ)رواه مسلم[1] واتە: دواهەمین نیشانە: ئاگرێكە لە یەمەنەوە دەردەچێت وخەڵكی بەرەو شوێنی كۆبونەوەیان ڕاپێچ دەكات.. ئنجا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم باسی چۆنیەتی ئەو كۆبونەوەیە دەكات و دەفەرموێت: (يُحشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طرَائِقَ رَاغِبينَ وَرَاهِبينَ وَاثنَانِ عَلَى بَعِيرٍ وَثَلَاثةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَأَربَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَتحشُرُ بَقِيَّتهُمُ النَّارُ تقِيلُ مَعَهُمْ حَيثُ قَالُوا وَتبِيتُ مَعَهُمْ حَيثُ بَاتوا وَتصبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا وَتمسِي مَعَهُمْ حَيثُ أَمسَوْا)متفق عليه[2]. واتە: خەڵكی بە سێ دەستە كۆ دەبنەوە، دەستەیەكیان بە ویستی خۆیان ولە تاوی ئاگرەكە بە تێری و بەسواری دەڕۆن ودەستەی دوەم: دودو بە سواری حوشترو سێ سێ بە سواری حوشترو چوارچوارو دەدە بە سواری حوشتر دەڕۆن . دەستەی سێیەم: ئاگر كۆیان دەكاتەوەو لە هەر شوێنێك سەرەخەویان شكاند لەگەڵیانەو لە هەر جێگەیەك مانەوە لەگەڵیان دەمێنێتەوەو لە هەر شوێنێك ڕۆژیان كردەوە لەگەڵیانەو لە هەر شوێنێك ئێوارەیان بەسەردا هات لەگەڵیانە. مەبەست لە ئاگری فیتنەكەیە، كە لەو ڕۆژەدا یەخە بە مرۆڤ دەگرێت و هیچ ساتێك لەكۆڵی نابێتەوە.

١ - موسلیم (٢٩٠١).

٢ - بوخاری (٦٥٢٢)، موسلیم (٢٨٦١).

## باسی دووەم: تێك چونی ژیان و بونەوەر

گەورەترین و ترسناکترین کارەسات، کە لە سەرەتای هاتنی ڕۆژی دواییدا ڕو دەدات، تێکچونی ژیان و بونەوەرە، دەستپێکی ئەم تێکچونەش ئەوەیە بە فەرمانی خوای گەورە فریشتە (ئیسرافیل) فوی یەکەم دەکات بەکەڕەنا (صُور) داو ڕێسای هەمو بونەوەر تێکدەچێت وبەم شێوەیە دەگۆڕێت:

١) ئاسمان شەق دەبات وخۆر دەکوژێتەوەو ئەستێرەکان هەڵ دەوەرن و زەوی وشاخەکان گرمەو ناڵە دەکەن ودەریاکان دەتەقنەوە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ﴾ الحاقة/١٣-١٦ واتە: ئەگەر فو کرا بەکەڕەنادا، هەرتەنها فویەك و زەوی و شاخەکان بارگران بون و پێکدا دران وگرمەیان کرد، هەر تەنها گرمەیەك، ئەوا ئەو ڕۆژە ڕوداوە سامناکەکە ڕو دەدات و ئاسمان شەق دەبات، چونکە لەو ڕۆژەدا لاوازەو هیچی بەسەر هیچیەوە نامێنێت. هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ﴾ الانفطار/١-٤ واتە: ئەگەر ئاسمانەکان لە یەك دابڕان، ئەگەر ئەستێرەکان پەرش و بڵاو بونەوە، ئەگەر دەریاکان تەقینەوەو ئەگەر گۆڕەکان هەڵتەکان.. واتە ئەو کاتە قیامەت هەڵ دەستێت، یان دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴿٦﴾ وَإِذَا

ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴾التكوير/ ١-٧ واتە: ئەگەر خۆر کوژایەوەو تینی نەما، ئەگەر ئەستێرەکان هەڵوەرین وکەوتنە خوارەوە، ئەگەر شاخەکان هەڵکەنران و دارمان، ئەگەر حوشتری ئاوس لە دەمانگیدا گوێیان پێ نەدرا و بەرەڵا کران، ئەگەر درندەکان کۆبونەوەو هیچیان لەوی تر نەکەوت، ئەگەر دەریاکان تەقینەوەو بونە گڕکان، ئەگەر نەفسەکان جوت خرانەوە..

٢) هەمو بونەوەر گۆڕانی بەسەردا دێت وبە پێچراوەی دەکەوێتە دەستی خوای گەورەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴾ابراهيم/٤٨ واتە: ڕۆژێك دێت کەزەوی دەگۆڕێت بە زەویەکی تر، ئاسمانەکان دەگۆڕێن وبە ملکەچی بۆخوای تاك و تەنها و زاڵ دەردەکەون. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (يَقْبِضُ اللهُ الأَرْضَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثمَّ يَقُولُ أنَا المَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ ) بوخاری[١] واتە: خوای گەورە زەوی هەڵدەگرێت و ئاسمانەکان بە دەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، ئنجا دەڵێ: من پاشام، پاشاکانی سەر زەوی لەکوێن ؟.

٣) هەرچی گیان لەبەرە بە زیندەوەرو مرۆڤ وئاژەڵ و جنۆکە و فریشتەوە هەمویان دەمرن و کەس نامێنێت، بێجگە لەوەی خوای گەورە دەیەوێت نەمرێت، وەك دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ﴾الزمر/٦٨ واتە: فودەکرێت بەکەڕەناداو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە زەندەقیان دەچێتودەمرن، مەگەر کەسێك خوا بیەوێت نەمرێت.

---

١- بوخاری (٦٠٣٨)، موسلیم (٤٩٩٤).

هـەروەها خـوای گـەورە باسـی پاتـاوی ئەوشـریخەو مەرگـە دەکـات و دەفـــــەرموێت: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ (٤٩) فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَىٰ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾یـــس/٤٩-٥٠ واتـــە: لـــە گرمـــەو هاوارێك، کە فوی یەکەمە زیاتر چاوەڕێیانە، دوچاری دەبـن و لـە ناویـان دەبات، لەو کاتەدا خـەریکی هەراو دژایـەتی یـەکن، نـەدەتوانن وەسـێتێك، بکەن نە بۆ لای کەس وکاریان دەگەڕێنەوە.

## بەندی دووەم: ئیمان هێنان بەو بەسەرهاتـانەی لە دوای مردن ڕو دەدەن

### باسی یەکەم: گیان کێشان

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی گیان کێشانی موسوڵمان دەفـەرموێت: (ئەگـەر بەنـدەی موسـوڵمان لـە دنیـا دابـڕاو بـەرەو قیامـەت وەرچەرخا، لە ئاسمانەوە فریشتە دێتە خوارەوە بۆ لای، ڕویان سپییە، دەم و چاویان دەڵێی خۆرە، کفنیان پێیـە لـە کفـنی بەهەشـت، مۆمیـاو بۆنیـان پێیە لە بۆنی بەهەشت، دێن و بـە دەوریـدا بـە ئەنـدازەی دورایـی بینـینی چـاو دادەنیشـن (واتـە هێنـدە زۆرن)ئنجـا فریشـتەی مـەرگ (ملـك المـوت) سەلامی خوای لێ بێت دێت و لـە لای سـەریەوە دادەنیشـێت و دەڵـێ: ئـەی نەفسی پاك، وەرە دەرەوە بـۆ لێخـۆش بون و ڕەزامەنـدی خـوا، پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (وەك چۆن دڵۆپە ئـاو لـە دەمـی گـۆزەوە دەتکێت ئاوا ئەو گیانە دەردەچێت، ئنجا دەیکێشێت و بە ئەندازەی ماوەی چاو تروکاندنێك لە دەستیدا نایهێڵێتەوە بـەڵکو هـەڵی دەگـرن و دەیخەنـە

کفن و بۆنە خۆشەکەوە، ئەو گیانە بۆنێکی لێ دێت وەك خۆشترین بۆنی سەر زەوی وایە)[١] ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ

---

١ ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی لەسەر نوسیوە (رواه احمد و ابو داود ، وهو صحيح على شرط الشيخين) بۆ زانیاری زیاتر: لای ئیمامی ئەحمد (١٨٠٦٣)یەو لای ئەبوداود (٤٧٥٣)یەو شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٦٧٦)دەڵێ: سەحیحە. ئەمەش هەمو فەرمودەکەیە: (عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: خَرَجْنَا فِي جِنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمَّا يُلْحَدُ قَالَ: فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرَ ، وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ ، وَقَالَ: " اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، فَإِنَّ الرَّجُلَ الْمُؤْمِنَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ مِنَ السَّمَاءِ مَلائِكَةٌ بِيضُ الْوُجُوهِ كَأَنَّ عَلَى وُجُوهِهِمُ الشَّمْسَ ، مَعَهُمْ حَنُوطٌ مِنْ حَنُوطِ الْجَنَّةِ ، وَكَفَنٌ مِنْ كَفَنِ الْجَنَّةِ ، حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ اخْرُجِي إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ قَالَ: فَتَخْرُجُ نَفْسُهُ فَتَسِيلُ كَمَا تَسِيلُ الْقَطْرَةُ مِنْ فِيِّ السِّقَاءِ ، فَأَخَذَهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَأْخُذُوهَا فَيَجْعَلُوهَا فِي ذَلِكَ الْكَفَنِ وَفِي ذَلِكَ الْحَنُوطِ ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْهَا كَأَطْيَبِ نَفْحَةِ رِيحِ مِسْكٍ وُجِدَتْ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ ، فَلا يَمُرُّونَ بِمَلإٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ إِلا قَالُوا: مَا هَذِهِ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ ؟ فَيَقُولُونَ: فُلانُ بْنُ فُلانٍ بِأَحْسَنِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيُفْتَحُ لَهُ فَيُشَيِّعُهُ مِنْ كُلِّ سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِي تَلِيهَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهَا إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اكْتُبُوا كِتَابَ عَبْدِي فِي عِلِّيِّينَ فِي السَّمَاءِ السَّابِعَةِ وَأَعِيدُوهُ إِلَى الأَرْضِ ، فَإِنِّي مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ وَفِيهَا أُعِيدُهُمْ وَمِنْهَا أُخْرِجُهُمْ تَارَةً أُخْرَى ، فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ ، فَيَقُولانِ: مَنْ رَبُّكَ ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ، فَيَقُولانِ: مَا دِينُكَ ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الإِسْلامُ ، فَيَقُولانِ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ ؟ فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ، فَيَقُولانِ: مَا يُدْرِيكَ ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ قَالَ: فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ أَنْ: صَدَقَ عَبْدِي فَافْرُشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا مِنَ الْجَنَّةِ فَيَأْتِيهِ مِنْ رُوحِهَا وَطِيبِهَا وَيُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ مَدَّ بَصَرِهِ ، وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ حَسَنُ الْوَجْهِ طَيِّبُ الرِّيحِ ، فَيَقُولُ: أَبْشِرْ بِالَّذِي يَسُرُّكَ ، فَهَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ ، فَيَقُولُ: مَنْ أَنْتَ فَوَجْهُكَ الَّذِي يَجِيءُ بِالْخَيْرِ ؟ فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الصَّالِحُ ، فَيَقُولُ: رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ ، رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ حَتَّى أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي وَمَالِي قَالَ: وَإِنَّ الْعَبْدَ الْكَافِرَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ عَنِ الدُّنْيَا وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ نَزَلَ إِلَيْهِ مِنَ السَّمَاءِ مَلائِكَةٌ سُودُ الْوُجُوهِ ، مَعَهُمُ الْمُسُوحُ ، حَتَّى يَجْلِسُوا مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ ثُمَّ يَأْتِيهِ مَلَكُ الْمَوْتِ فَيَجْلِسُ عِنْدَ رَأْسِهِ فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ اخْرُجِي إِلَى سَخَطٍ مِنَ اللَّهِ وَغَضَبٍ . قَالَ: فَتَتَفَرَّقُ فِي جَسَدِهَا فَيَنْتَزِعُونَهَا وَمَعَهَا الْعَصَبُ وَالْعُرُوقُ كَمَا يُنْتَزَعُ السَّفُّودُ مِنَ الصُّوفِ الْمَبْلُولِ ، فَيَأْخُذُونَهَا فَيَجْعَلُونَهَا فِي تِلْكَ الْمُسُوحِ قَالَ: وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَنْتَنِ جِيفَةٍ وُجِدَتْ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ ، فَلا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ إِلا قَالُوا: مَا هَذِهِ الرُّوحُ الْخَبِيثَةُ ؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ: فُلانُ بْنُ فُلانٍ بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا ، فَيُسْتَفْتَحُ ، لَهُ فَلا يُفْتَحُ لَهُ ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ إِلَى آخِرِ الآيَةِ قَالَ: فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّينٍ فِي الأَرْضِ السَّابِعَةِ السُّفْلَى ، وَأَعِيدُوهُ إِلَى الأَرْضِ ، فَإِنِّي مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ وَفِيهَا نُعِيدُهُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُهُمْ تَارَةً أُخْرَى ، قَالَ: فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحًا ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا

ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾الانعام/٦١ واتە: هەر کە ئەجەلی یەکێکیان هات، نێرراوەکانمان دەیمرێنن و فەرامۆشی ناکەن..

هەروەها دەربارەی گیان کێشانی بێ ئیمان دەفەرموێت: (ئەگەر بەندەی بێ ئیمان لە دنیا دابڕاو بەرەو قیامەت چەرخایەوە، لە ئاسمانەوە فریشتەی بۆ دادەبەزن، ڕقن و بەهێزن، دەم و چاویان ڕەشە، کفنی زبری مویی یان پێ یە، بە ئەندازەی دورایی بینینی چاو بە دەوریدا دادەنیشن، ئنجا فریشتەی مەرگ (مَلَكُ المَوت) دێت و لە لای سەریەوە دادەنیشێت و دەڵێ: ئەی نەفسە پیسەکە وەرە دەرەوە بۆلای خەشم و توڕەیی خوا، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (گیانەکەی بە لاشەیدا بڵاو دەبێتەوە، ئەویش بە دەرکێشان دەری دەکێشێت وەك چۆن دڕك لە خوری تەڕ دەردەکێشرێت و ڕەگ و دەمارەکانی پێوەی دەپچڕێن، ئنجا هەمو فریشتەکانی نێوان ئاسمان و زەوی و هەمو فریشتەکانی ئاسمان نەفرینی لێ دەکەن و دەرگاکانی ئاسمان دادەخرێن، دەرگاوانەکانی هەر دەرگایەك لە خوا دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی گیانەکەی بە لایاندا بەرز نەکرێتەوە، ئنجا فریشتەی مەرگ دەیکێشێت و بە ئەندازەی چاو تروکاندنێك لە دەستیدا نایهێڵێتەوە، بەڵکو دەیخەنە ئەو کفنە زبرەوە و بۆنی بۆگەنترین کەلاکی سەر زەوی لێ دێت) (تەواوکەری فەرمودەکەی پێشو).

---

خَرَّ منَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي به الرِّيحُ في مَكَانٍ سَحيقٍ قَالَ: ثُمَّ تُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَده قَالَ: فَيَأْتيه مَلَكَان فَيُجْلسَانه ، فَيَقُولان لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ ، لا أَدْري قَالَ فَيَقُولان: مَا دينُكَ ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لا أَدْري قَالَ: فَيَقُولان لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذي بُعثَ فيكُمْ ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لا أَدْري قَالَ: فَيُنَادي مُنَادٍ منَ السَّمَاء أَنْ كَذَبَ عَبْدي فَافْرِشُوهُ منَ النَّار وَأَلْبسُوهُ منَ النَّار وَافْتَحُوا لَهُ بابا منَ النَّار وَيَأْتيه منْ حَرِّهَا وَسَمُومهَا وَيُضَيَّقُ عَلَيْه قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلفَ أَضْلَاعُهُ قَالَ: وَيَأْتيه رَجُلٌ قَبيحُ الْوَجْه مُنْتنُ الرِّيح ، فَيَقُولُ: أَبْشرْ بِالَّذي يَسُوءُوكَ ، هَذَا يَوْمُكَ الَّذي كُنْتَ تُوعَدُ ، فَيَقُولُ: وَمَنْ أَنْتَ فَوَجْهُكَ الَّذي يَجِيءُ بِالشَّرِّ ؟ قَالَ: فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الْخَبيثُ قَالَ: فَيَقُولُ: رَبِّ لا تُقم السَّاعَةَ ، رَبِّ لا تُقِم السَّاعَةَ ) .

## باسی دووەم: تاقیکرانەوەی ناو گۆڕ

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی تاقیکرانەوەی موسوڵمان دەفەرموێت: (دو فریشتە دێنە لای، کە زۆر بە سامن پێیدا هەڵدەشاخن و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێت: پەروەردگارم (الله)یە، دەڵێن: ئایینت چییە ؟ دەڵێت: ئایینم ئیسلامە، دەڵێن ئەو پیاوە کێ بو لە ناوتاندا ڕەوانە کرابو؟ دەڵێت: ئەو پیاوە نێرراوی خوایە، دەڵێن: کردەوەت چی بو ؟ دەڵێت: کتێبەکەی خوام خوێندەوەو ئیمانم پێ هێناو ڕاستم کرد، یەکێکیان پێیدا هەڵدەشاخێت و دەڵێت: پەروەردگارت کێیە ؟ ئاینت چییە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەوە دوایین تاقیکرانەوەیە، کە توشی موسوڵمان دێت، ئەوەیە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) واتە: خوا ئەوانە دامەزراو دەکات، کە ئیمانیان هێناوە بە وتەی چەسپاو دامەزراو لە ژیانی دنیادا. ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم (اللە) یە، ئایینم ئیسلامە، پێغەمبەرم (محمد)ە صلى الله عليه وسلم، ئنجا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: ئەوا بەندەکەم ڕاستی کرد)(تەواوکەری فەرمودەی پێشو)

هەروەها دەربارەی تاقیکرانەوەی بێ ئیمان لە گۆڕدا دەفەرموێت: (..دوو فریشتە دێنە لای، کە زۆر بە سامن پێیدا هەڵدەشاخن ودایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێت: ها ها نازانم ! دەڵێن: ئایینت چییە ؟ دەڵێت: ها ها نازانم، دەڵێن ئەی دەربارەی ئەو پیاوەی بۆتان ڕەوانە کرابو چی دەڵێیت ؟ ڕێ بە ناوەکەی نابات ونایدۆزێتەوە، دەڵێن: محمد دەڵێ: ها ها نازانم، گوێم لە خەڵك بو وایان

دەوت ! پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: پێی دەگوترێ: نەزانیت و نەخوێندتەوە، ئنجا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەكات: ئەوە درۆی كرد)(فەرمودەی پێشو)[1].

## باسی سێیەم: مەینەتی و شادی ناو گۆڕ

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەربارەی شادی و خۆشی (موسوڵمان) لە گۆڕدا دەفەرموێت: (...بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەكات: ئەوا بەندەكەم ڕاستی كرد، لە ڕایەخی بەهەشتی بۆ ڕاخەن و لە پۆشاكی بەهەشت بۆ لەبەر كەن، دەرگایەكی بەرەو بەهەشتی بۆ بكەنەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: لە بۆن و بەرامەی خۆشی بەهەشتی بۆ دێت و گۆڕەكەی بە ئەندازەی بینایی چاوی بۆ فراوان دەكرێت، هەروەها دەفەرموێت: (پیاوێك دێتە لای، ڕوخساری جوانە، جل و بەرگی جوانە، بۆنی خۆشە، دەڵێ: مژدەت لێ بێت، بەو مژدەیەی دڵخۆشت دەكات، مژدەت لێ بێت بە ڕەزامەندی خواو بەهەشتانێك، كە بەهرەو خۆشی نەبڕاوەیان تێدایە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە، كە بەڵێنت پێدرابو، كە پێی بگەیت، ئەویش پێی دەڵێت: تۆش، خوا مژدەی چاكەت بداتێ، تۆ كێیت؟ ئەو ڕوەی تۆ ڕویەكە مژدەی پێ بێت، دەڵێ: من كردەوە

---

١ ــ فەرمودەی تر لەسەر باسی هاتنی ئەو دو فریشتەیەی خوای گەورە بۆ لای مردو و پرسیاركردنیان لێی زۆرە ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه و سلم وەكو عائیشەخان خوا لێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە لە پاڕانەوەیدا دەیفەرمو: (اللهمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ من الْكَسَلِ والْهَرَمِ والْمَغْرَمِ والْمَأْثَمِ ، اللهمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ مِن عذابِ النَّارِ وَفِتْنَةِ النَّارِ ، وَفِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ) بوخاری (٦٠١٤) ، ئیمامی ئیبنوحەجەر لە (فتح الباری ١١/١٧٧)دا لە شەرحیدا دەڵێ: مەبەستی لە ئازارو ژانی گۆڕ پرسیاری دو فریشتەكەیە...شێخی موبارەكفوری ڕەحمەتیش لە شەرحیدا لە (تحفة الأحوذي ٩ / ٣٢٨) دا دەڵێ: مەبەست لە تاسان و واق وڕمان و سەرسام بونە لە وەڵامی ئەو دو فریشتەدا .

چاکەکانتم، سوێند بە خوا من نەمناسیویت بەو جۆرە نەبێت، کە لە گوێڕایەڵی کردنی خوادا خێرا بویت و لەسەرپێچی خوادا خاو بویت، خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، پاشان دەرگایەکی بەهەشت و دەرگایەکی دۆزەخی بۆ دەکرێتەوەو پێی دەوترێت: ئا ئەوە جێگەت بو، ئەگەر سەرپێچی خوات بکردایە، خوا بۆی گۆڕیویت بەوە، ئنجا کاتێك دەبینێ بەهەشت چ نازو نیعمەتێکی تێدایە، دەڵێ: خوای پەروەردگار، زو قیامەت بێنە، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای کەس و کارم، پێی دەوترێت: ئارام بگرەو بسرەوە.

هەروەها دەربارەی سزاو مەینەتی(بێ ئیمان) دەفەرموێت: (... بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات: ئەو درۆی کرد، لە ڕایەخی دۆزەخی بۆ ڕاخەن و دەرگایەکی بەرەو دۆزەخی بۆ بکەنەوە، ئنجا لە گەرماو بۆن و دوکەڵەکەی بۆ دێت و هێندە گۆڕەکەی لێ تەسك دەکرێتەوە، هەتا پەراسوەکانی دەچن بە ناویەکدا و پیاوێك دێتە لای، کە ڕوخساری ناشیرینە، جل و بەرگی ناشیرینە، بۆنی ناخۆشە: پێی دەڵێت: مژدەت لێ بێت بەو مژدەیەی دڵ گرانت دەکات، ئەمە ئەو ڕۆژەیە، کە بەڵێنت پێدرابو پێی بگەیت، ئەویش دەڵێت: تۆش خوا مژدەی شەڕت پێ بدات، تۆ کێی ؟ ئەو ڕوەی تۆ ڕویەکە مژدەی شەڕی پێیە، دەڵێ: من کردەوە پیسەکانتم، سوێند بە خوا من نەمناسیویت بەو جۆرە نەبێت، کە لە گوێڕایەڵی خوادا خاو بویت و لە سەرپێچی کردنی خوادا بە پەلە بویت، خوا پاداشتی شەڕت بداتەوە، پاشان خوا یەکێکی دەکات بە توشەوە، کە کوێرو کەڕ و لاڵەو گورزێکی بەدەستەوەیە، ئەگەر بیدات بە شاخدا دەیکات بە خۆڵ، پاشان خوای گەورە وەك خۆی لێ دەکاتەوە، هەروەها گورزێکی تری لێ دەدات زریکەو هاوارێك دەکات هەمو شتێك دەیبیستێت،

تەنها مرۆڤ و جنۆكە نەبێت، پاشان دەرگایەكی دۆزەخی بۆ دەكەنەوەو جێگەیەكی ئاگری بۆ ڕادەخرێت، دەڵێ: خوایە قیامەت هەڵمەستێنە)(فەرمودەی پێشو).

## بەندی سێیەم: ئیمان هێنان بە زیندو بونەوە

تەوەری ئەم باسە لەم خاڵانەدا كورت دەبێتەوە:

## باسی یەكەم: كات و شێوەی زیندو بونەوە

هەر وەك كاتی هاتنی ڕۆژی دوایی نەزانراوە، بە هەمان شێوە كاتی زیندو بونەوەش نادیارە؛ ئەوەندە هەیە پاش ئەوەی جیهانی بەرزەخ بەسەر دەچێت، خوای گەورە ئاوێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت خەڵكی لەسەر كلێنجكەی خۆیان دەژیێنەوەو دروست دەكرێنەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَابَيْنَ النَّفْخَتينِ أربَعُونَ قَالَ: أربَعُونَ يَومَاً ؟ قالَ: أبَيْتُ، قَالَ: أربعونَ شَهرَاً؟ قَالَ: أربعونَ سَنَةً ؟ قَالَ: أبَيتُ، قَالَ: ثُمَّ يَنْزِلُ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءَ فَيَنْبتُونَ كَمَا يَنْبُتُ البَقْلُ، لَيسَ مِنَ ألإنسانِ شَئٌ ألَّا يَبْلَى ألَّا عِظَامَاً واحِداً و هُوَ عُجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الخَلْقُ يَومَ القيامَةِ)متفق عليه[1] واتە: ماوەی نێوان دو فوەكە چلە، یەكێك لە هاوەڵان فەرموی: چل ڕۆژە ؟ فەرموی: ڕێگە نەدراوم، وتی: چل مانگە ؟ فەرموی: ڕێگە نەدراوم، وتی: چل ساڵە؟ فەرموی: ڕێگە نەدراوم، واتە: ڕێگە نەدراوم باسی بكەم، فەرموی: پاشان خوای گەورە ئاوێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێ. ئنجا خەڵكی وەك دانەوێڵە دەژیێنەوە، هیچ شوێنێكی لاشەی

---

١ ـ بوخاری (٤٦٥١) ، موسلیم (٢٩٥٥).

مرۆڤ نامێنێت نەڕزێت تەنها ئێسقانێك نەبێت ئەویش کلێنجکەیە، کە ڕۆژی دوایی خەڵکی لەوە دروست دەکرێنەوە..

ئنجا فوی دوەم دەکرێت بە کەڕەناداو خەڵکی سەرجەم ڕاست دەبنەوە، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ الزمر/٦٨ واتە: پاشان فویەکی تر دەکرێت بە کەڕەناداو هەمویان ڕاست دەبنەوەو دەڕوانن.

٢) حاڵەتی زیندو بونەوە: خوای گەورە بە گیان و لاشە بەندەکان زیندو دەکاتەوەو لەسەر ئەو شێوەیە گیانیان دەکاتەوە بە بەرداو ڕاست دەبنەوە، کە لەسەری مردون، پەروەردگار لە وەڵامی ئەوانەدا، کە دەپرسن: (مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ؟) واتە: کێ ئێسقانەکان زیندو دەکاتەوە، لە کاتێکدا ڕزیون؟ دەفەرموێت: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾یس/ ٧٩ واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بڵێ: ئەو خوایە زیندوی دەکاتەوە، کە یەکەم جار پێکی هێناوەو دروستی کردوە، هەروەها دەفـــــــەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُ ۝٣ بَلَىٰ قَادِرِينَ عَلَىٰ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾القيامة/٣-٤ واتە: ئایا مرۆڤ وای دادەنێت، کە دوای ڕزین و پوکان ئێسقانەکانی کۆ ناکەینەوە؟! بەڵێ ئێمە بە توانایین کەوا نەخشەی سەری پەنجە پانەکەشی دێنینەوە.

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيهِ) رواه مسلم[1] واتە: هەمو بەندەیەك لەسەر ئەو شێوەیە زیندو

١ ـ موسلیم (٢٧٧٨).

دەکرێتەوە، کە لەسەری مردوە . هەروەها لە فەرمودەی (صحیح)دا هاتوە کاتێك، کە شەهید زیندو دەکرێتەوە برینەکەی خوێنی لێ دەچۆڕێت[١].

## باسی دووەم: بەڵگەکانی زیندو بونەوە

**یەکەم: زیندو بونەوە لە کاربەجێیی خواوە سەرچاوە دەگرێت.**

ئاشکرایە خوای گەورە بەندەکانی بە هەوانتە دروست نەکردوە، بەڵکو بۆ ئەنجامدانی پەیامێك دروستی کردون، ئەویش پەیامی بەندایەتی و یەکخواپەرستییە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾الذاريات/٥٦ واتە: جنۆکەو مرۆڤم بۆ ئەوە دروست کردوە، کە تەنها بەندایەتیم بۆ بکەن، واتە: بە تەنها بم پەرستن، چونکە پەروەردگار خاوەنی سیفەتی کاربەجێییەو یەکێك لە ناوە جوانەکانی (الحکیم)ە واتە: (کاربەجێ) لەم بارەیەشەوە دەفەرموێت: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ .... ﴾المؤمنون/١١٥-١١٦ واتە: ئایا واتان داناوە کە ئێمە هەر بە گاڵتە ئێوەمان دروست کردوەو ناگەڕێنەوە بۆ لامان ؟ بەرزی و بڵندی بۆ خوای پاشای ڕاستەقینە .

**دووەم: زیندو بونەوە لە توانایی خواوە سەرچاوە دەگرێت بەڵگەی ئەم ڕاستییەش چەند دیاردەیەکە:**

١- خوای گەورە ئەم بونەوەرەی بەو هەموو وردەکاری و گەورەیی و فراوانییەوە دروست کردوە، هیچ ئەرك و ماندو بونێکی بە دەستیەوە

---

١ - وەکو ئەو فەرمودەی بوخاری و موسلیم لەسەری ڕێکن، کە دەفەرموێ: (لا يُكَلَّمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكَلَّمُ فِي سَبِيلِهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَجُرْحُهُ يَثْعَبُ دَمًا ، اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ ، وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ)مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ .

نــەدیوە، بێگومــان دروســت کردنــەوەی مرۆڤــی بــە لاوە ئاســانترە، وەك دەفــەرموێت: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾یــس/٨١ واتــە: ئایــا ئــەو خوایــەی ئاسمانــەکان وزەوی دروست کردوە توانـای نییـە نمونـەی ئـەو بـێ ئیمانانـە دروسـت بکاتـەوە؟ بەڵی، بە توانایەو هەر خۆی دروستکارو زانایە.

ب ـ خوای گـەورە بـەردەوام و هەمیشـە بـە توانایـە لـە تـەنی بـێ گیـان لاشـەی زینـدو دروسـت بکـات، لـە ڕەوشـتی ژیانیشـدا چـەندەها نمونـەی بەرچاو دەبینین، لەوانە:

١) سـەرەتا مـرۆڤ لـە مـاددە بـێ گیانـەکانی زەوی دروسـت دەکـات، وەك دەفــەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ..﴾الحج/٥ واتە: ئەی خەڵکینە، ئەگـەر ئێـوە گومانتـان لـە زینـدو بونەوە هەیە ئەوا بزانن، کە ئێوەمان لـە خـاك و پاشـان لـە تنۆکـە ئاوێـك دروست کردوە.

٢) ڕۆژانە هەزارەها خانەی زیندوی لەشی مرۆڤ دەمرن و لە جێ یانـدا هەزارەهای تر دروست دەبنەوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ..﴾الأنعــام/٩٥ واتــە: خــوا زینــدو لــە مــردو دەردێنێت و مردوش لە زیندو دەخاتەوە.

٣) لـە زسـتاندا هـەمو دارو درەخـت و گـژو گیـای زەوی دەمـرن و وشـك دەبن و زەوی دەبێتـە خـاکێکی وشـك و بـێ گیـان، ئنجـا لـە بـەهاردا خـوای گەورە زینـدوی دەکاتـەوەو هـەمو ڕوەك و درەختـەکان دەژیێنێتـەوە، وەك دەفـــــەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ

وَرَبَتْ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾فصلت/٣٩ واتە: لە نیشانەکانی توانایی خوا ئەوەیە دەبینی زەوی کزۆڵ و وشك و ڕوتەنە، ئنجا ئەگەر ئاومان بەسەردا باراند ڕادەچەنێت و پەرەدەسەنێت و دەژییێتەوە، ئەو خوایەی زیندوی دەکاتەوە، زیندو کەرەوەی مردوانە، هەر ئەویشە بەسەر هەمو شتێکدا توانایە .

ج ـ خوای گەورە هەر لە دنیادا چەندەها دیمەنی زیندو کردنەوەی مردوی نیشانی بەندەکانی داوە، وەك لە سورەتی (البقرة) دا چەند نمونەیەکی باس کردوە، لەوانە:

١- داستانی ئەو کوژراوەی، کە (بەنو ئیسرائیل) لە ناو خۆیاندا بو بە کێشەیان لەسەری و بۆیان ساغ نەدەبوەوە ئایا کێ کوشتویەتی، ئنجا خوای گەورە فەرمانی پێ کردن، کە مانگایەك سەر ببڕن و بە هەندێك لە لاشەکەی بدەن لە مردوەکە بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو کەسەیان پێ بدات، کە کوشتویەتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَٰءْتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾البقرة/٧٢-٧٣ واتە: کاتێك یەکێکتان کوشت و پاکانەی خۆتان دەکردو بوە کێشەتان لەسەری، بەڵام خوا ئاشکراکەری ئەو تاوانەیە، کە دەتان شاردەوە، ئێمەش وتمان بە هەندێك لە لاشەی مانگا سەربڕاوەکە بدەن لە مردوەکە، ئا بەو شێوەیە خوا مردوان زیندو دەکاتەوەو ئایەتەکانیتان نیشان دەدات، بەڵکو ژیر ببن .

٢) داستانی سەیدنا ئیبراهیم علیه السلام کاتێك داوای لە خوای گەورە کرد، کە نیشانی بدات چۆن مردو زیندو دەکاتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ

وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾البقرة/٢٦٠ واتە: کاتێك ئیبراهیم (علیه السلام) وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە، بزانم چۆن مردوان زیندو دەکەیتەوە ؟ فەرموی: ئایا ئیمانت نییە؟ وتی: بەڵێ ئیمانم هەیە، بەڵام دەمەوێت دڵنیا ببم، فەرموی: چوار باڵندە بێنەو بەرەو ڕوی خۆت پارچە پارچەیان بکە، پاشان هەر پارچەیەکیان بخەرە سەر شاخێك لەو شاخانەی دەورو بەرت، ئنجا بانگیان بکە، بە هەڵە داوان بەرەو ڕوت دێنەوەو بزانە، کە خوا شکۆمەندو کاربەجێیە..

## بەندی چوارەم: ئیمان هێنان بە حەشرو کۆبونەوە

حەشر: واتە ڕاپێچ کرانی دروست کراوان بە بەرایی و کۆتاییانەوە بەرەو گۆڕەپان و ئێستگەیەك، کە تێیدا کۆدەکرێنەوەو ڕادەوەستێنرێن و چاوەڕوانی جیاکردنەوەو یەکلاکردنەوەی دادوەری نێوانیان و، دیاریکرانی چارەنوسی خۆیان دەکەن، ئاشکرایە ئەم باسە وردەکاری زۆر هەڵدەگرێت و گەلێك فراوانە، بەڵام لێرەدا پوختەیەکی لە چەند خاڵێکدا گەڵاڵە دەکەین:

### باسی یەکەم: شوێنی حەشرو کۆبونەوە

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لِأَحَدٍ ) متفق عليه[١] واتە: خەڵکی ڕۆژی دوایی لەسەر خاکێکی سپی سور باوی

---

١ـ فتح الباری (١١/٣٧٢)، شەرحی موسلیم (٤/٢١٥).

وەك نانی بێگەرد كۆدەكرێنەوە، كە هیچ نیشانەو بەرزی و نزمییەكی بۆ كەس تێدا نییە.

## بارو دۆخی حەشر:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا كَمَا خُلِقُوا ثُمَّ قَرَأَ ( إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا)وَأَوَّلُ مَنْ يُكْسَى مِنْ الْخَلَائِقِ إِبْرَاهِيمُ)متفق عليه[1] واتە: (ئێوە بە پێی پەتی و ڕوتی و خەتەنە نەكراوی حەشر دەكرێن، خوای گەورە دەفەرموێت: وەك یەكەم جار دروستمان كردون، ئاواش دروستیان دەكەینەوە، یەكەم دروست كراوێك، كە پۆشاكی لەبەر دەكرێت ئیبراهیمە سەلامی خوای لێ بێت . هەروەها دەفەرموێت: (يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ يُسْمِعُهُمْ الدَّاعِي وَيَنْفُذُهُمْ الْبَصَرُ وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنْ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لَا يُطِيقُونَ وَلَا يَحْتَمِلُونَ ) متفق عليه[2] واتە: خەڵكی سەرەتاو كۆتاییان لە بیابانێكدا كۆ دەكرێنەوە، هەرچی دەنگێكیان لێوە بێت دەبیسرێت، هەرچی بكەن دەبینرێت و خۆر نزیك دەبێتەوەو خەڵكی پەژارەو مەینەتیان دەگاتە ڕادەیەك، كە تواناو پشویان لێ دەبڕێت،

یاخود دەفەرموێت: ( تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ الْخَلْقِ حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ قَالَ سُلَيْمُ بْنُ عَامِرٍ فَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا يَعْنِي بِالْمِيلِ أَمَسَافَةَ الْأَرْضِ أَمْ الْمِيلَ الَّذِي تُكْتَحَلُ بِهِ الْعَيْنُ قَالَ فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ

---

١ـ بوخاری (٣٣٤٩) ، موسلیم (٢٨٦٠) .

٢ ـ بوخاری (٤٣٤٣)فتح الباری (٨/٣٤٨ ژ ٤٧١٢)، موسلیم (٣٨٧).

أعمَالِهِمْ فِي العَرَقِ فمِنهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلى كَعبَيهِ وَمِنهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلى رُكبَتيـهِ وَمِنهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلـى حَقْوَيـهِ وَمِـنهُمْ مَـنْ يُلجِمُـهُ العَـرَقَ إِلجَامًـا قَـالَ وَأَشَـارَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللـهُ عَلَيـهِ وَسَلمَ بيَـدِهِ إِلـى فِيـهِ ) رواه البخـاري[1] واتـە: لـە ڕۆژی دوایی دا خۆر هێندە لە خەڵکی نزیك دەخرێتەوە تاکو بە ئەندازەی میلێك لێیانەوە دورە، ئنجا خەڵك بە پێی کردەوەکانیان ئارەق دەکەنـەوە، هەیانە ئارەق تاکو قولە پێی دێت، هەیانە تاکو ئەژنۆی دێت، هەیانە تـاکو پشتێنەی دێت، هەیانە ئارەق تاکو لەغاوەی دەمی دێـت و لـەغاوی دەکـات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئاماژەی بـۆ دەمـی کـرد . ئـەوە بـە ستونی ئارەقیـان هێنـدە بـەرز دەبێتـەوە بـەلاَم بـە ئاسـۆیی حـەفتا گـەز درێـژ دەبێتەوە، وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (حَتّـى يَـذهَبَ عَرَقُهمْ فِـي الأَرضِ سَـبعينَ ذِرَاعـاً..) متفـق عليـه واتـە: تـاکو عارەقەکـەیان حـەفتا گـەز بـە زەوی دا دەڕوات.. ئنجـا لـەو ڕۆژەدا بـێ ئیمـان لەسـەر ڕو حەشر دەکرێـت وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗا﴾الإسـراء/٩٧ واتـە: ئەوانـەی گـومڕان ڕۆژی دوایـی لەسەر ڕویان حەشریان دەکەین، بە کوێری و کەڕی و لاڵی . پیاوێك وتـی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژیی دوایی بێ ئیمان لەسەر ڕو حەشـر دەکرێـت ؟ فەرموی: (أَلَيسَ الذي أَمْشَاهُ عَلَـى الـرِّجْلَينِ فِي الـدُّنيا قـادِراً علـى أنْ يُمْشِيهِ عَلَى وَجْهِهِ يَـومَ القِيامَـةِ)متفـق عليـه[2]. واتـە: ئایـا ئـەو خوایـەی لـە دنیـادا

---

١ ـ موسلیم (٢٨٦٤)، ترمزی (٢٤٢١). ئەمە ڕیوایەتی سەیدنا میقدادی کوڕی ئەسـوەدەو موسـلیم لێوەی گێڕاوەتەوە ، ئەوەی نوسەری بەڕێز ئامـاژەی پێـداوە، کـە بوخارییـە ، ئەمدۆزیـەوە .. ئـەوەی بوخاری، موسلیم لەسـەری ڕێکـن ، ئەمەیـە: (يَعْـرَقُ النَّـاسُ يـومَ القيامَـةِ حَتَّـى يَـذهَبَ عَـرَقُهم فِي الأَرضِ سبعينَ ذِراعَاً، ويُلْجِمُهُـمْ حَتَّـى يَبْلُـغَ آذَانَهُـم) کـە لای بوخـاری (٦١٦٧) ەو لای موسـلیم (٢٨٦٣ )ەو لـە مەسنەدی ئیمامی ئەحمەددا وا لە (٤١٩/٢).

٢ـ بوخاری (٦٥٢٣)، موسلیم (٢٨٠٦) .

لەسەر دو پێ دەیبات بەڕێوە، توانای نییەکە ڕۆژی دوایی لەسەر ڕوی بیبات بەڕێوە؟.

بەڵام موسوڵمانان و پارێزکاران بە پێشوازییەوە حەشر دەکرێن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾مریم/٨٥ واتە: لەو ڕۆژەدا پارێزکاران بە پێشوازییەوە حەشر دەکرێن بەرەو خوای بەخشندە.

## باسی دووەم: تکاکردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی حەشردا

کاتێك خەڵکی لەو ڕۆژەدا تینی گەرما تەڕایی یان لێ دەچنێت و جەنجاڵی و سەرقاڵی پشویان لێ دەبڕێت و، چاوەڕوانی ئارامیان لێ هەڵدەگرێت، هەمو کۆدەبنەوەو بڕیار دەدەن لەسەر ئەوەی تکاکارێك بەرنە لای خوای گەورە بۆ ئەوەی لەو مەینەتییە ڕزگاریان بکات، ئنجا دێنە لای هەرکام لە (ئادەم)و (نوح)و (ئیبراهیم)و (موسا)و (عیسا) سەلامی خوایان لێ بێت و داوایان لێ دەکەن لەلای خوای گەورە تکایان بۆ بکەن، بەڵام هەریەکەیان بە جۆرێك پۆزش (عذر) دێنێتەوەو دەڵێت: من کەسی ئەو تکایە نیم، خوای گەورە ئەمڕۆ ئەوەندە توڕە بوە، هەرگیز لەمە و پێش هێندە توڕە نەبوە.. خۆم... خۆم... خۆم. ئنجا دوا جار دێنە لای پێغەمبەری ئیسلام صلی الله علیه وسلم و داوای لێ دەکەن ببێتە تکاکار، پێی دەڵێن: (يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللهِ وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ وَغَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ)واتە: ئەی موحەمەد تۆ نێرراوی خواو دواین پێغەمبەریت، خوا لە گوناهی بەرو دوات خۆش بوە، لە لای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینیت لە چ حاڵەتێکداین ؟ پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم

دەفەرمویێت: (فأنْطلِقُ فآتي تحتَ العَرشِ فأقعُ سَاجدًا لِربِّي ثـمَّ يَفْـتحُ اللّـهُ عَلَيَّ وَيُلهِمُنِي مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسنِ الثنَاءِ عَلَيهِ شَيئًا لَـمْ يَفتحْـهُ لِأحَـدٍ قبلِـي ثمَّ يُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفعْ رَأسَكَ سَلْ تعطَهْ اشْفَعْ تشَفَعْ فـأرْفعُ رَأسِـي فـأقُولُ يَا رَبِّ أمَّتِي أمَّتِي فيُقَالُ يَـا مُحَمَّـدُ أدخِـلْ الجَنّـةَ مِـنْ أمَّتِـكَ مَـنْ لَـا حِسَابَ عَلَيْهِ مِنَ البَابِ الأيمَنِ مِنْ أبوَابِ الجَنّةِ) متفق عليـه[١] واتـە: منـیش دەڕۆم و دەچمە ژێر عەرش، بە سوجدە دەکەوم بۆ پەروەردگاری مـەزنم، پاشـان خوا لە سوپاس و ستایشی خۆی شتێکم فێـر دەکـات، کـە لـە پـێش منـەوە فێری هیچ کەسی تری نەکردوە ، پاشان دەگوترێت: ئەی موحەمەد سەرت بـەرز کـەرەوە، داوا بکـە پێـت دەدرێـت، تکـا بکـە تکـات گـیرا دەبێـت، ئنجـا سەرم بەرز دەکەمەوەو دەڵێم: ئوممەتەکەم ئەی پەروەردگار، ئوممەتەکەم ئـەی پـەروەردگار، دەگوترێـت: ئـەی موحەمـەد هەرکـەس لێپرسـینەوەی لەسـەر نییەلـە ئوممەتەکـەت، لـە دەرگـای ڕاسـتی دەرگاکـانی بەهەشـتەوە، بیخەرە ژورەوە.

## بەندی پێنجەم: ئیمان هێنان بە لێپرسینەوەو پاداشت

ئاشکرایە خوای گەورە ژیـانی دنیـای کـردوە بـە تاقیگەیـەك بـۆ ئـەوەی بەندەکانی تێدا تاقی بکرێتەوەو چاك و خراپ و موسوڵمان و بێ ئیمانیان لــە گۆڕەپــانی کــاردا دەربکــەوێت و پــەردە لەســەر نــاواخنی خۆیــان هەڵبدەنــەوە.. پاشــان لــە ڕۆژی دواییــدا دادگاییــان دەکــات و لێیــان دەپرسێتەوەو لەسەر کردەوەکانیان پاداشتیان بۆ دیاریی دەکات، لێرەدا بـە چەند خاڵێك پوختەی ئەم باسە ڕون دەکەینەوە:

---

١ بوخاری (٤٤٧٦ ، ٦٥٦٥) ، موسلیم (١٩٣).

## باسی یەكەم: نمایش كرانی بەندەكان لە وێستگەی لێپرسینەوەدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴾ الكهف/ ٤٨ واتە: بەرێز دێنە ڕوی پەروەردگارت و پێیان دەڵێین: ئەوا بەو شێوەیە هاتنە لامان، كە یەكەم جار دروستمان كردن. هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾الحاقة/١٨ واتە: لەو ڕۆژەدا نمایش دەكرێن و دەخرێنە ڕو، هیچ نهێنی و پەنهانێكتان ناشاردرێتەوە .

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: ( مَا مِنكُمْ مِنْ أحَدٍ إلَّا وَسَيُكَلِّمُهُ اللهُ يَومَ القِيَامَةِ لَيسَ بَينَ اللهِ وَبَينَهُ تَرْجُمَانٌ ) رواه البخاری[1] واتە: هەریەكێك لە ئێوە لە ڕۆژی دوایی، خوای گەورە قسەی لەگەڵدا دەكات، لە نێوانی ئەو خوادا هیچ وەرگێڕ(تەرجومەوان)ێك نییە...

٢- لێپرسینەوەو دادگایی كران:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴾ الغاشية/٢٥-٢٦ واتە: گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە، پاشان لێپرسینەوەیان لەسەر ئێمەیە . پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (لَيسَ أحَدٌ يُحَاسَبُ يَوْمَ القِيَامَةِ إلَّا هَلَكَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ألَيسَ قَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى فَأمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ إنَّمَا ذَلِكِ العَرْضُ وَلَيسَ أحَدٌ يُنَاقَشُ الحِسَابَ يَوْمَ القِيَامَةِ إلَّا عُذِّبَ)رواه البخاری[2] واتە: هیچ كەس نییە لە ڕۆژی دواییدا

١ ـ بوخاری (٧٤٤٣)، موسلیم (١٠١٦) .

٢ بوخاری (٦٠٥٦).

لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت و تیا نەچێت، عائیشە خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی خوا نافەرموێت: ئەو کەسەی نوسراوەکەی درایە دەستی ڕاستی، ئەوە لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموی: ئەوە تەنها ڕو بە ڕو بونەوەیە، هیچ کەس نییەلە ڕۆژی دوایی دا دادگایی بکرێت و سزا نەدرێت.

## باسی سێیەم: تەرازو نامەی کردەوەکان

کردەوەی بەندەکان بە چاك و خراپییەوە دەکێشرێت وخوای گەورە تەرازوی ڕاستەقینەی بۆ دادەنێت، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾الأنبياء/٤٧ واتە: تەرازوەکانی دادگەریی بۆ ڕۆژی دادەنێین و هیچ نەفسێك هیچ ستەمێکی لێ ناکرێت، ئەگەرچی بە ئەندازەی کێشی دەنگە تۆوێکیش بێت، دەیهێنینە ڕو، بەسە بۆ ئەوەی ئێمە داد پرس بین.

**نامەی کردەوەکان:**

خوای گەورە بۆ هەر کەسێك و فریشتەی پارێزەری داناوە، تاکو کردەوەکانی بە ورد و درشت و ئاشکراو پەنهانەوە بنوسن، لە تۆماری بکەن و ڕۆژی دوایی نامەی ئەو کردەوانە دەداتە دەستیان و دەبێتە بەڵگە نامەی ڕۆژی دادگایی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ

ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾الإسراء/١٣-١٤ واتە: هەمو مرۆڤێك چارەنوسی خۆیمان خستوەتە گەردنی خۆی، لە ڕۆژی دواییدا نوسراوێکی بۆ دەردەهێنین و بە کراوەیی دەیدرێتێ و پێی دەڵێین: نوسراوەکەت بخوێنەرەوە، بەسە ئەمرۆ کە خۆت دادپرسی خۆت بیت و حوکمی خۆت بدەیت . هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾الكهف/٤٩ واتە: نوسراو نامەی کردەوەکان دانراوەو دەبینی تاوانباران مەترسی یان هەیە لەوەی تێیدا تۆمار کراوەو دەڵێن: سەرگەردان خۆمانین، ئەرێ ئەم کتێبە چییە، خۆ هیچ کردەوەیەکی بچوك و گەورەی نەهێشتوەتەوە ئاماری نەکردبێت.. ئاوا دەبینن ئەوەی لە تاوان و خراپە کردویانە هەموی دێتەوە ڕێیان ! پەروەردگارت ستەم لەکەس ناکات. هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُوا۟ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا﴾الإنشقاق/٧-١٢ واتە: ئنجا هەرکەسێك نوسراوەکەی درایە لای ڕاستی، ئەوا لێپرسینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵ دەکرێت و بە دڵخۆشی دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری، بەڵام ئەو کەسەی نوسراوەکەی لە پشتەوە درایە، ئەوا داخوازی تیاچون دەکات و دەچێتە دۆزەخەوە .

## بەندی شەشەم: ئیمان هێنان بە حەوز (الحوض)

پاش ئەوەی مەینەتی ڕۆژی حەشر و لێپرسینەوەو تەرازو نامە وەرگرتن كۆتایی پێ دێت و دێتە سەر ئەوەی، هەركەس بەرەو چارەنوسی حەتمی و یەكجاری خۆی بڕوات، ئا لەو تاو ساتە وەختەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش ئوممەتەكەی دەكەوێت بۆ سەر حەوزێك، كە خوای گەورە ئامادەی كردوە، دەچنە سەری و لێی دەخۆنەوەو تاسەی یەكجاری تینویەتیان دەشكێت و شەكەتی و ماندویەتی یان بەسەر دەچێت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی ئەو حەوزە دەفەرموێت: (أنَا فرَطكُمْ علَى الحَوضِ، مَنْ وَرَدَ شَرِبَ، وَمَنْ شَربَ لَمْ يَظمَأْ أبَدًا) متفق علیه[1] واتە: من پێشتان دەكەوم بۆ سەر حەوزەكە، هەركەس هاتە سەری لێی دەخواتەوە، هەر كەس لێی خواردەوە هەرگیز تینوی نابێت... هەروەها دەفەرموێت: (حَوضِي مَسِيرَةُ شَهرٍ، مَاؤُهُ أبيَضُ مِنَ اللّبَنِ، وَرِيحُهُ أطيَبُ مِنَ المِسكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنهَا فَلا يَظمَأُ أبَدًا)رواه البخاري واتە: حەوزەكەم مانگە ڕێیەك درێژە، ئاوەكەی لە شیر سپی ترە، بۆنی لە میسك خۆشترە، قاپ و پەرداخەكانی وەك ئەستێرەكانی ئاسمان وان، هەركەس لێی بخواتەوە هەرگیز تینوی نابێت .

### حەوتەم: ئیمانهێنان بە پردی (صِراط)

پاش ئەوەی دادگایی باڵای ڕۆژی دوایی كۆتایی پێ دێت و لێپرسینەوە تەواو بێت و بڕیاری كۆتایی دەردەچێت، ئنجا تێكڕای بەندەكان بەرەو دوا

---

١- بوخاری (٦١١٩)، موسلیم (١٧٩٢/٤ ژ ٢٢٩). فەرمودەكان كە لەسەر باسی حەوزو كەوسەرن زیاتر لە هەشتا یاوەر گێڕاویانەتەوە... بۆیە ئەوەندە دڵنیاییان دروست كردوە گەیشتونەتە سنوری متەواتر...

هەواری خۆیان بەرێ دەخرێن و سەرەتا بەسەر پردی (صراط)دا، کە بەسەر دۆزەخدا ڕایەڵ کراوە دەڕۆن، هەرکەسێ پەڕییەوە، ئەوا براوەیەو بەختەوەرە، ئەوەی دەریش نەچو ئەوا ڕەنج بێوەرو خاکە سارە، خوای گەورە دەربارەی گوزەر کردن بەسەر دۆزەخدا دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾مریم/٧١ واتە: هیچ یەکێك لە ئێوە نییەبەسەر دۆزەخدا نەڕوات . پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئەو پردە دەفەرموێت: (... وَيُضرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهرَيْ جَهَنَّمَ وَفِي جَهَنَّمَ كَلَالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ ؟ فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلَّا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ فَمِنْهُمْ، يَعْنِي الْمُوبَقَ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمُ الْمُخَرْدَلُ حَتَّى يُنَجَّى) اخرجه الشيخان[1] واتە: پردی سیرات بە ناوەڕاستی پشتی دۆزەخدا ڕایەڵ دەکرێت، من و ئوممەتەکەم یەکەم دەستەین، کە بە سەریدا گوزەر دەکەین، لەو ڕۆژەدا هیچ کەس قسە ناکات پێغەمبەران نەبێت، ئەوانیش لەو ڕۆژەدا نزایان ئەوەیە: خوایە گیان بێوەیی، خوایە گیان بێوەیی. دۆزەخ قولاپی تێدایە وەك درکی (سەعدان) وایە، ئایا (سەعدان) تان دیوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموی: ئەو قولاپانە وەك درکی (سەعدان)وان، بەڵام ئەندازەی گەورەییان خوا نەبێ کەس نایزانێت، خەڵکی بە پێی کردەوە خراپەکانیان ڕادەفرێنن، لەوانە موسوڵمانی وا هەیە بە هۆی کردەوەی خراپییەوە پێوە دەبێت و گیر دەخوات و هەیانە سزا دەدرێت هەتا ڕزگاری دەبێت.

---

١ ـ بوخاری (٧٤٣٧) ، موسلیم (١٨٢) .

## بەندی هەشتەم: ئیمان هێنان بە بەهەشت و دۆزەخ

بەهەشت و دۆزەخ: دو دروستکراوی خوای گەورەن، یەکەمیان ڕەحمەتی خوایە، دوەمیان سزای خوایەو پێش دروست کردنی بەندەکان دروستی کردون، ئێستا ئامادەن و هەرگیز لە ناو ناچن و دوا هەوارگەی هەمیشەیی بەندەکانن.

### باسی یەکەم: بەهەشت

خانەی بەختەوەری و بەهرەمەندییەو خوای گەورە ئامادەی کردوە بۆ ئەو بەندانەی موسوڵمان و پارێزکاران و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و لە موسوڵمانی و خواناسییەکەیاندا دڵسۆزن و شوێن پەیامی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی دەکەون، بەهەشت کانگای بەهرەو خۆشییەو سەرچاوەی حەوانەوەی ڕاستەقینەیەو ڕەحمەتی نەبڕاوەی خوای گەورەیە، لایەنەکانی ئەم ڕاستییەشمان لە چەند خاڵێکدا بۆ ڕون دەبێتەوە کە ئەمانەن:

**یەکەم: بەهەشت حەوانەوەی دەرونی و مەعنەوی و ڕەهاو بێ سنوری تێدایە چونکە:**

ا - ژیانی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەست لەم جۆرە ژیانەش ئەوەیە دو سیفەتی تێدا بێت:

**١) مردنی بەسەردا نەیەت:**

واتە هەرکەس چوە بەهەشتەوە مردن ناچێژێت و لە خەمی ئەوەدا نییە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو بەهرەو خۆشییەی لە دەست بچێت و لێی دابڕێت، ئەمەش گەورەترین حەوانەوەی دەرونییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ﴾الدخان/٥٦

واتە: لە بەهەشتدا مردن ناچێژن، بێجگە لە مردنی یەکەمجاری دنیا . پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إذَا صَارَ أهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَأهْلُ النَّارِ إلَى النَّارِ جِيءَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ . ثُمَّ يُذْبَحُ ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ: يَا أهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ، وَيَا أهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ، فَيَزْدَادُ أهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ وَيَزْدَادُ أهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ ) متفق علیه[1] واتە: کاتێك بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشت و دۆزەخییەکان دەچنە دۆزەخ، مردن دەهێنرێت هەتا دەخرێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخەوە، ئنجا سەر دەبڕێت، پاشان بانگ دەرێك بانگ دەکات: ئەی بەهەشتییەکان مردن نەماو ئەی دۆزەخییەکان مردن نەما، بەهەشتییەکان خۆشی تریان لەسەر خۆشییەکانیانەوە زیاتر دەبێت، دۆزەخییەکان پەژارەیان لەسەر پەژارەیانەوە زیاتر دەبێت.

٢ ) لاوازی و پەك کەوتەیی ڕوی تێ ناکات:

واتە بەهەشتییەکان نە پیر دەبن و نە نەخۆش دەکەون و نە بێ هێز دەبن، ئەمەش تەواوکەری ژیان هەمیشەییە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إذَا دَخَلَ أهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ يُنَادِي مُنَادٍ: إنَّ لَكُمْ أنْ تَحْيَوْا فَلَا تَمُوتُوا أبَدًا، وَإنَّ لَكُمْ أنْ تَصِحُّوا فَلَا تَسْقَمُوا أبَدًا، وَإنَّ لَكُمْ أنْ تَشِبُّوا فَلَا تَهْرَمُوا أبَدًا، وَإنَّ لَكُمْ أنْ تَنْعَمُوا فَلَا تَبْأسُوا أبَدًا ) رواه مسلم[2] واتە: ئەگەر بەهەشتییەکان چونە بەهەشتەوە بانگ دەرێك بانگ دەکات: ئێوە بۆتان دانراوە بژین و هەرگیز نەمرن، لەش ساغ بن و هەرگیز نەخۆش نەکەون، گەنج بن و هەرگیز پیر نەبن، ڕابوێرن و لە خۆشیدا بن و هەرگیز توشی ناخۆشی نەبن .

---

١ ـ بوخاری (٤٤٥٣) ، موسلیم (٢٨٤٩).

٢ ـ موسلیم (٢٨٣٧ )

ب-دڵنیایی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەست لەوەیە بەهەشتیەکان چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە دەستەبەری ئەو دڵنیاییە ڕاستەقینەیە دەکەن؛ کە ئەمانەن:

١) دڵ ساغ و دەرون پاکن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾ الحجر/٤٧-٤٨ واتە: هەرچی ڕق و کینەیە لە دڵ و دەرونیان دادەڕنین و هەمو برای یەکن و لە سەر جێگەی حەوانەوەدا بەرامبەر یەکن و لە بەهەشتدا هیچ ماندو بونێکیان توش نابێت و هەرگیز لێی دەرناکرێن .

٢) دڵخۆش و شادن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴾الزخرف/٦٨-٧٠ واتە: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ئێوە نەترستان لە سەرەو نە پەژارەش دەخۆن؛ ئەو بەندانەی کە ئیمانیان هێناوەو لە دنیادا ملکەچمان بون؛ بڕۆنە بەهەشتەوە ئێوەو خێزانەکانتان بە دڵخۆشی

٣) پاکژو خاوێنن: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ وَلَا يَتْفُلُونَ وَلَا يَبُولُونَ وَلَا يَتَغَوَّطُونَ وَلَا يَمْتَخِطُونَ قَالُوا فَمَا بَالُ الطَّعَامِ قَالَ جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ وَحَدَّثَنَا)رواه مسلم[1] واتە:

١- موسلیم (٢٨٣٥).

بەهەشــتییەکان لــە بەهەشــتدا دەخــۆن دەخۆنــەوەو پیســی ناکــەن و بەڵغەمیان نییەو میز ناکەن، بەڵکو خواردنەکەیان بە جواناو دەردان وەك ڕشێنەی میسك هەر دەکەن و سبحان الله والله اكبر دەخرێنە سەر زمانیـان وەك چۆن هەناسەیان پێ دەدرێت.

٣) جوان و ڕوخسار شیرینن: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفـەرموێت:(إنَّ لِأهلِ الجَنّةِ سُوقًا يَأتونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ فِيهَا كُثبَانُ المِسْكِ، فإذَا خَرَجُوا إلَيْهَا هبَّتْ رِيحٌ فتملأُ وُجُوهَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ مِسكًا فيَـزْدَادُونَ حُسنًا وَجَمَالًا ...) رواه مسلم[1] واتــە: (لــە بەهەشــتدا بازاڕێـك هەیـە، بەهەشــتییەکان هــەمو هەفتەیەك دێن و تێیدا کۆدەبنەوە، ئنجا بـای بـاکور هـەڵ دەکـات و دەدات بە دەم و چاو جل و بەرگیانـدا جوانی و قەشـەنگییان پێـی زیـاد دەکـات، دەگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانیان، دەبینن ئەوانیش جوانی و قەشەنگییان زیادی کردوە .

هەروەها دەفـەرموێت: ( إنَّ أوَّلَ زُمـرَةٍ تـدخُلُ الجَنَّـةَ عَلـى صُـورَةِ القَمَـرِ لَيلَةَ البَدرِ ثمَّ الذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أشَدِّ ضَوْءِ كَوكَـبٍ دُرِّيٍّ فِـي السَّمَاءِ إضَـاءَةً ) متفق عليه[2] واتە: یەکەم دەسـتە، کە دەچـنە بەهەشـتەوە لەسـەر شـێوەی مانگن لە شەوی چواردەدا، پاشان ئەوانەی بە دوایاندا دێن لەسـەر شـێوەی درەوشــاوەترین ئەســتێرەی ئاسمــانن . یــاخود دەربــارەی خێزانــەکانیان دەفەرموێت: (.. وَلِكُلِّ واحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا مِنَ وَرَاءِ اللَّحْمِ مِنَ الحُسْنِ) رواه البخـاري و مسـلم[3] واتـە: هەریـەکیان دو هاوسـەری هەیـە مۆخی ئێسقانی لاقیان لە پشت گۆشتەکەوە دەبینرێت.

---

١ ـ موسلیم (٢٨٣٣).
٢ ـ بوخاری (٣١٤٩) ، موسلیم (٧٣٢٨) .
٣ ـ بوخاری (٣٠٧٤) ، شەرحی موسلیم (٢٨٣٤) .

٥) ڕێزدارو شکۆمەندن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾الزمر/٧٣ واتە: ئەو کەسانەی پارێزکارو لە خواترس بون بە کۆمەڵ بەرەو بەهەشت بەڕێ دەخرێن، هەتا دەگەنە بەر دەرگای بەهەشت، دەرگاکانی دەکرێنەوەو دەرگاوانەکانی پێیان دەڵێن: سڵاوی خواتان لێ بێت، ئیتر سەر فرازن و حەوانەوە، چونکە لە دنیادا پاك بون، بە هەمیشەیی بچنە ناویەوە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾الواقعة/١٧-١٨ واتە: نەوجەوانانی هەمیشە زیندو بەسەریاندا دەگەڕێن، بە پەرداخ و سوراحی پڕ لە شەڕابی سەرچاوەی ڕەوانەوە.

یاخود دەفەرموێت: ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾الإنسان/١٥-١٦ واتە: قاپی زیوین و پەرداخی شوشەیان بەسەردا دەگێڕن: شوشەی لە زیو، کە ئەندازەی شەڕابەکەیان گرتوە بە ئەندازە گیری و بێ زیادو کەم.

**دووەم: بەهەشت حەوانەوەی جەستەیی و لاشەیی ڕەهاو بێ سنوری تێدایە: چونکە:**

ا- خۆشی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەست لەو خۆشییەیە، کە سێ تایبەتمەندی هەبێت:

١) نەبڕاوە بێت: خوای گەورە دەربارەی خۆشی بەهەشت دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ﴾ الرعد/٣٥ واتە: وێنەو سیفەتی ئەو بەهەشتەی، کە خوا بەڵێنی داوە بە

پارێزکاران پێیان بدات ئەوەیە لە ژێریەوە ڕوبار دەڕۆن و خۆراك و سێبەرەکانی هەمیشەیین.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ (٣٢) لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ﴾الواقعة/٣٢-٣٣ واتە: میوەی زۆریان پێ دەدرێت؛ نە دەبڕێت و نە لێیان قەدەغە دەکرێت.

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إنَّ أدنَى مَقْعَدِ أحَدِكُمْ مِنَ الجَنَّةِ أن يَقُولَ لَهُ تَمَنَّ فيَتَمَنَّى وَيَتَمَنَّى، فيقولُ لَهُ: هَلْ تَمَنَّيْتَ ؟ فيقولُ: نَعَم، فيقولُ لَهُ: فإنَّ لَكَ مَا تَمَنَّيْتَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ)رواه مسلم[1] واتە: نزمترین جێگەو پایەی یەکێك لە ئێوە لە بەهەشتدا کەسێکە پێی دەوترێت: ئاوات بخوازە ؛ ئەویش هەر ئاوات دەخوازێت و ؛ ئاوات دەخوازێت ؛ ئنجا پێی دەڵێن: ئاواتت خواست ؟ دەڵێت: بەڵێ: پێی دەڵێن: ئەوەی ئاواتت بۆ خواست پێت دەدرێت و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت .

٢ ) **بێ گرفت بێت:** واتە ئەرك و ماندو بونی نەوێت و پاشەڕۆك و دەرئەنجامی خراپی لێ نەکەوێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴾الحجر/٤٨ واتە: لە بەهەشتدا ماندویەتییان توش نابێت و هەرگیز لێی دەرناکرێن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴾الرحمن/٥٤ واتە: لەسەر جۆرە دۆشەکێك پاڵیان داوەتەوە، کە بەرەکەی ئاوریشمەو میوە چنی ئەو دو باخچەیە نزیکە دەستە . پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (يَأكُلُ أهلُ الجَنَّةِ فيهَا

---

١ ـ موسلیم (١٨٢).

وَيَشْرَبون وَ لا يَتغَوَّطونَ وَ لا يَبُولونَ..) رواه مسلم[١] واتە: بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا دەخۆن و دەخۆنەوەو پیسی ناکەن و بەڵغەمیان نییەو میز ناکەن .

٣) بەخواستی بەندە بێت: واتە بە پێی حەزو ویستی خۆی بێت و لە هەر کاتێکدا ئارەزوی بکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيۡنَا مَزِيدٞ﴾ق/٣٥ واتە: هەرچی دەیانەوێت لە بەهەشتدا پێیان دەدرێت، ئێمەش زیاترمان لە لایە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ٢٠ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ﴾الواقعة/٢٠-٢١ واتە: میوەیان پێ دەدرێت لەوەی هەڵی دەبژێرن و گۆشتی باڵندەیان بۆ ئامادە دەکرێت لەوەی حەزیان لێیەتی و ئارەزوی دەکەن.

**ب- چەشتنی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەست لەو چەشتنە دو خاڵە:**

١) کۆتا سنوری چەشتنە: واتە هەرچەندە بنۆشن لێی بێزار نابن و ئەوپەڕی چێژو لەزەتی لێ دەبینن . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ﴾الزخرف/٧١ واتە: هەرچی نەفس حەزی لێ بکات و چاو چێژی لێ ببینێت لە بەهەشتدا هەیە.. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم لە فەرمودەی قودسییدا دەفەرموێت: (قالَ اللهُ تعَالى: أعْدَدْتُ لِعبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لا عَيْنٌ رَأتْ وَلَا أذُنٌ سَمِعَتْ وَلَا خَطرَ عَلى قَلْبِ بَشَرٍ فاقْرَؤوا إنْ شِئْتمْ فَلَا تعْلَمُ نَفْسٌ مَا أخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أعْيُنٍ)متفق عليه[٢] واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو نازو نیعمەتانەی بۆ بەندە

---

١ - موسلیم (٢٨٣٥).

٢- بوخاری (٣٠٠٥، ٣٠٧٢) ، موسلیم (٢٨٢٤) .

چاکەکانمم ئامادەم کردوە نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستویەتی و نە بە خایلەی دڵی مرۆڤیشدا هاتوە.. هەروەها دەفەرموێت: (يَعْطِي قُوَّةَ مِائَةِ رَجُلٍ )[١] واتە: هەر پیاوێك توانای سەد پیاوی پێ دەدرێت..

٢) هەمەڕەنگی چەشتنە: واتە بەهەشت چەندەها جۆر نازو نیعمەتی تێدایەو چێژو لەزەتی هەمەچەشنیان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ المطففين/٢٢-٢٨ واتە: چاکە کاران لە نازو بەهرەی خوادان؛ لەسەر تەخت و سەکۆوە دەڕوانن؛ هەر بە ڕوخسارياندا ديارەدەی خۆشگوزەرانی دەبينيت؛ شەرابی خاوێنی شیلەداری سەرمۆریان دەرخوارد دەدرێت، کەدوا قومی بۆنی میسکی لێ دێت، با بۆ ئەو بەخشش و بەهرە مەزنە پێشبڕکێ و کێ بڕکێ بکەن ئەوانەی پێشبڕکێ دەکەن، کە لەگەڵ ئاوی (تەسنیم) تێکەڵ کراوە، ئەویش کانییەکە ئەوانە لێی دەخۆنەوە، کە لە خواوە نزیکن..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا رُزِقُوا۟ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا ۙ قَالُوا۟ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَأُتُوا۟ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا ۖ﴾البقرة/٢٥ واتە هەر کاتێك لە بەرو بوم و میوەیەکی بەهەشتیان پێ دەدرێت و تامی دەکەن، دەڵێن: ئەمە هەر لەو میوەیەی پێشوە، کە خواردمان، بەڵام کە دەیهێنن دەبینن جیاوازە.

---

١ـ نوسەری بەڕێز هەر ئەوەندەی نوسیوە: (رواه الترمذي واسناده حسن)بۆ زانیاری زیاتر: لای ئیمامی ئەحمەد (١٨٨٢٧)، ئیبنوحیببان (٤٤٣/١٦ ، بە سەحیحیشی داناوە ، شێخی ئەلبانی رەحمەتیش لە ( صحيح الجامع ١٦٢٧ )) دا بە سەحیحی داناوە .

یان دەفەرموێت: ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ ٢٧ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ٢٨ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ٢٩ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠ وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ٣١ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ﴾الواقعة/٢٧-٣٢ واتە هاوەڵانی دەستە ڕاست، دەزانن هاوەڵانی دەستە ڕاست کێن، ئەوانەن لە باخی (سدر)ی بێ دڕکدان و لە ناو درەختی مۆزی هێشو پڕدان و لەبەر سێبەری دورو درێژدان و لەبەر ئاوی گیراوەدان و لەناو میوەی زۆرو جۆراو جۆردان.

**سێیەم: بەهەشت شادمانی گیانی تێدایە: مەبەست لەمەش دو خاڵە.**

١) بینینی خوای پەروەردگار: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ﴾القيامة/ ٢٢-٢٣ واتە: دەم و چاوانێك لە ڕۆژی دواییدا درەوشاوەو کراوەو پرشنگدارن، تەماشای پەروەردگاریان دەکەن، پێغەمبەریش صلى الله عليه و سلم دەفەرموێت: (إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النَّارِ قَالَ فَيَكْشِفُ الحِجَابَ فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ) رواه مسلم[١] واتە: کاتێك بەهەشتییەکان چونە بەهەشتەوە، خوای گەورەو بێ هاوتا دەفەرموێت شتێکی ترتان دەوێت بۆتانی زیاد بکەم ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەدی ڕوت سپی نەکردوین؟ ئەدی نەتخستوینە بەهەشت و لە دۆزەخ دەربازت نەکردوین؟ خوای گەورە پەردە لا دەدات و زاتی پیرۆزی دەبینن، جا هیچ شتێکیان لە سەیر کردنی خوای گەورە بەلایانەوە خۆشتر بێت پێ نەدراوە.

---

١ـ موسلیم (١٨١).

٢) ڕەزامەندی یەکجاری خوای پەروەردگار:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى﴾ الفجـر /٢٧ -٣٠ واتـە: ئـەی نەفسـی ئارام‌و دڵنیا بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت، بە ڕەزامەندی و لێڕازی بـون بچۆرە ڕیزی بەندەکانمەوەو بچۆرە بەهەشتەکەمەوە.

پێغەمبـەریش صـلی الله علیـه وسـلم دەفـەرموێت: خـوای گـەورە بـە بەهەشتییەکان دەفـەرموێت: (هَلْ رَضِيتمْ ؟) ئایـا ڕازی بـون؟ ئـەوانیش دەڵێن: بۆچی ڕازی نابین ئەی پەروەردگار، خۆ تۆ بەهرەیەکت پێ داوین، کـە بـە هـیچ دروسـت کراوێکـی تـرت نـەداوە؟! خـواش دەفـەرموێت: (ألَا أعْطِيكُمْ أفْضَلَ مِنْ ذلِكَ ؟)واتە: ئایا لەوە چاکترتان پێ بدەم ؟ دەڵێن: چی لەوە باشترە؟ دەفەرموێت: (أحِلُ عَلَيكُمْ رُضواني، فـلا أسْخَطُ عـلَيكُمْ بَعْدَهُ أبَدَاً)متفق علیـه[١] واتـە: ڕەزامەنـدی خۆمتـان بەسـەردا دەڕێـژم، لـەوەو دوا هەرگیز لێتان توڕەو زویر نابم.

## باسی دوەم: دۆزەخ

خانـەی مەینـەت و خاکەسـارییەو خـوای گـەورە ئامـادەی کـردوە بـۆ سزادانی ئەوانەی بێ ئیمانو خوا نەناس و یاخی و سەرکەشن و سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و خۆبەزل زان و ئارەزو بازن و شوێن حـەزو ئـارەزوی خۆیـان دەکـەون، دۆزەخ کانگـای مەینـەت و مەرگەسـاتەو سەرچـاوەی ژان و ئـازاری ڕاسـتەقینەیە، ئـەم ڕاسـتییەشمان لـە چـەند خاڵێکدا بۆ ڕون دەبێتەوە:

---

١ بوخاری (٦٥٤٩)، موسلیم (٢٨٢٩).

**یەکەم: سزاو ئازاری دەرونی و مەعنەوی ڕەهاو بێ سنوری تێدایە، چونکە.**

**١- مەینەتی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەستمان سێ خاڵە.**

١) دۆزەخییەکان مردنیان بەسەردا نایەت: واتە: ژیانی نەمرو نەژی بەسەر دەبەن، بە هیوای ئەوە نین ڕۆژێك لە ڕۆژان لەم مەینەتییە ڕزگاریان ببێت، گەرچی پاش ملیۆنەها ساڵیش بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾الأعلى/١٣ واتە: پاشان لە دۆزەخدا نە دەمرێ و نە دەژی.

لە فەرمودەیەکی پێشودا باسی ئەوەمان کرد، کە مردن لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدا سەر دەبڕڕێت و بە نیشتەجێ ی هەردو لایان دەوترێ: مردن نەماو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموی: (وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا الى حُزْنِهِمْ) متفق عليه واتە: دۆزەخییەکان پەژارەیان لەسەر پەژارەکانیانەوە زیاتر دەبێت.

٢) دان بە ستەمکاری و تاوانباری خۆیاندا دەنێن: بەڵام هیچ پاساو قوربانییەکیان لێ وەر ناگیرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾﴾الملك /٨ -١١ واتە: هەرکاتێك دەستەیەك فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە خەزنەدارەکەی پرسیاریان لێ دەکات: ئایا هیچ کەسێکی هۆشدەرو ترسێنەرتان بۆ ڕەوانە نەکرا ؟ دەڵێن: بەڵێ: بۆمان هات و بە درۆمان خستەوەو وتمان خوا هیچ شتێکی نەناردوەتە خوارەوە، ئێوە لە گومڕاییەکی گەورەدان و هیچی تر، هەروەها دەڵێن: ئەگەر ئێمە بمان بیستایەو بیرمان بکردایەتەوەو ژیر بوینایە لە دۆزەخییەکان

نەدەبوین و هاودەمی ئاگر نەدەبوین، دان بە تاوانی خۆیاندا دەنێن، تێکشکان و دارزین بۆ دۆزەخییەکان. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾المعارج/١١-١٧ واتە: تاوانبار پێی خۆشە بۆ ئەوەی لە سزای ئەو ڕۆژە خۆی ڕزگار بکات، قوربانی بە کوڕەکەی و بە هاوسەرو براکەی بدات، هەروەها بەو هۆزەی، کە لە دنیادا داڵدەی دەدات، بە هەرچی لە زەوی دایە، تا ڕزگاری بێت، بەڵام نا، لێی وەرناگیرێت، سزای ئەو ئاگری دۆزەخە، کە پێستی سەر دادەماڵێت، بانگ لە هەر کەسێك دەکات، کە پشت لە ڕاستی بکات و ڕو وەرگێڕێت.

٣) سوك و ڕسواو بێ ڕێزن: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَمْكُرُونَ﴾الأنعام/١٢٤ واتە: ئەوانەی تاوانبارن دوچاری ڕسوایی و سزای سەخت دەبن لەلای خوا بە هۆی ئەو تەڵەکە بازییەوە کە دەیکەن .

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَسَبُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةٍۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾یونس/٢٧ واتە: ئەوانەی کردەوەی خراپەیان ئەنجام داوە، پاداشتی خراپەکەیان بە وێنەی خۆیەتی و سەر شۆڕی و ڕسوایی دایان دەگرێت، هیچ پەنایەکیان نییە لە خوایان ڕزگار بکات، دەڵێی دەم و چاویان پارچەیەك لە شەوی تاریك دای پۆشیوە، ئەوانە لە ئاگردان وبە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

ب- پەژارەی ڕاستەقینەی تێدایە: واتە ئەو بارو دۆخەی تێیدان سەرجەم خەم ئامێزەو پەژارەو سوێ دەکەنە دڵی دۆزەخییەکانەوە، وەك:

**١) دۆزەخییەکان دڵ نەخۆش و دەرون پیسن:**

مەبەست لەوەیە، کە تێکڕایان داخ لە دڵن و ڕقیان لە یەکتر دەبێتەوەو نزای شەڕ لەیەك دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱدْخُلُوا۟ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ فِى ٱلنَّارِ ۖ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُوا۟ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾الأعراف/٣٨ واتە: هەرکاتێك کۆمەڵێك دەچێتە دۆزەخەوە نەفرین لە کۆمەڵەکەی هاوڕێی دەکات، تاکو تێکڕایان تێك دەترنجێن و دواییەکان بە پێشینەکان دەڵێن: پەروەردگار ئا ئەوانە گومڕایان کردین، خوایە لە ئاگری دۆزەخ سزای چەند جارەیان بدە، دەفەرموێت: هەریەکەتان سزای چەند جارە دەخۆن بەلام نازانن . هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴾ فصلت/٢٩ واتە: ئەوانەی بێ ئیمانن دەڵێن: پەروەردگارمان ئەوانەمان نیشان بدە لە جنۆکەو مرۆڤ، کە گومڕایان کردین، با بیانخەینە ژێر پێمان ولەوانە بن کە ڕسواو بەرپێن.

**٢) خەمبارو دلگران و بە پەژارەن:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ابراهیم/٢١ واتە: لاوازو

بەردەستەکان بەوانە دەڵێن، کە لوت بەرزو خۆ بەزل زان بون: ئێمە شوێن کەوتوی ئێوە بوین، ئایا هیچ سودێکمان سەبارەت بە سزای خوا پێ دەگەیەنن؟! دەڵێن: ئەگەر خوا ڕێنمایی ئێمەی بکردایە ئەوا ڕێنماییمان دەکردن، ئنجا سەغڵەت و غەمبار بین، یان خۆڕاگرو ئارامگر بین، وەك یەکەو دەرچونمان نییە. هەروەها دەفەرموێت:﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾البقرة/١٦٧ واتە: ئا بەو شێوەیە خوا کردەوەکانیان نیشان دەداتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی چەندان پەژارەو پەشیمانی بۆیان ولە ئاگری دۆزەخ ڕزگارنابن.

**٣) پیسییان دەرخوارد دەدرێت و تێیدا دەتلێنەوە:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ۝٢٤ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا﴾النبأ/٢٤-٢٥ واتە: هیچ ساردی و خواردنەوەیەکی تێدا ناچێژن، بێجگە لە ئاوی کوڵاو کێماو زوخاو. هەروەها دەفەرموێت: ﴿مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسۡقَىٰ مِن مَّآءٖ صَدِيدٖ ۝١٦ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٞ﴾ابراهيم/١٦-١٧ واتە: بە دوای ژیانی هەمو یاخییەکدا دۆزەخ هەیەو لە کێماو تێر ئاو دەکرێت[١]، قومی لێ دەدات و ناتوانێت قوتی بدات، چونکە زۆر بۆگەن و بێزراوە، لە هەمو لایەکەوە مەرگ و پەژارەی توند ڕوی تێدەکات و نامرێت، لە دوایەوە سزایەکی سەخت چاوەڕێی دەکات. ئەبو ئومامە خوای لێ ڕازی بێت دەربارەی ئەو کێماوەی دەرخواردی دەدرێت دەفەرموێت: لێی نزیك

---

١ـ زۆرینەی موفەسسیران فەرمویانە کە ئەو (ماءٌ صَديدٌ)ە هەر ئەو ئارەق و خوێناو کێماوەیە کە لە جەستەی دۆزەخیەکانەوە دەتکێت و ئەوەندە زۆر دەبێت دەدرێتەوە هەر بە خۆیان کە تاوانبارن .. خوا لاماندا .. تەفسیری قورتوبی و ئیبنوکەسیرو بەغەوی / تەفسیری ئایەتەکەی سەرەوە ..

دەخرێتەوە بێزی لێ دەکاتەوەو پێی ناخۆشە، ئنجا کاتێك زیاتر لێی نزیك دەخرێتەوە هەمو دەم و چاوی داخ دەکات و پێستی سەری دادەماڵێت، کاتێکیش خواردیەوە هەمو ڕیخۆڵەکانی دەپچڕێنێت و لە کۆمیەوە دەردەچێت.. رواه الامام احمد. هەروەها لە ڕوباری (الغوطة) دەر خواردیان دەدرێت، وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی دەفەرموێت: (نَهَرٌ يَجْرِي مِنْ فَرْجِ الْمُومِسَاتِ، يُؤْذِي أَهْلَ النَّارِ رِيحُ فُرُوجِهِمْ)رواه احمد[١] واتە: ڕوبارێکە لە داوێنی ئافرەتی داوێن پیسەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆنی داوێنیان ئازاری دۆزەخییەکان دەدات.

**دووەم: سزاو ئازاری جەستەیی و لاشەیی ڕەهاو بێ سنوری تێدایە چونکە.**

ا- ئــازاری ڕاســتەقینەی تێدایــە: مەبەســت لــەو ئازارەیــە، کــە ســێ تایبەتمەندی هەیە:

١) نەبڕاوە بێت: وەك خوای گەورە دەربارەی دەفـەرموێت ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾البقـرة/١٦٢ واتـە: بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننەوەو سزاکەیان لەسەر سوك ناکرێت و سـاتێکیش لێـی دانـابڕێن .

هــــەروەها دەفــــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ﴾ النســـاء/٥٦ واتـــە: هـــەرکاتێك پێستەکانیان سـوتاو هەڵقرچا بـە پێستی تـر بۆیـان دەگـۆڕین بـۆ ئـەوەی ئازاری بەردەوام بچێژن.

---

١ ـ ئیمامی ئەحمەد لە کتێبی الزهدەکەی خۆیدا ئەم ریوایەتەی هێناوەتەوە بەڵام کەسم نەبینی لـە فەرمودەوانان پلەی سەحیح یان حەسەنی بداتێ ، شـێخی ئـەلبانی رەحمـەتیش لـە (سلسـلة الاحاديـث الضعيفة ١٤١٠)دا هێناوێتیەوە کە زەعیفە ..

٢) بە مەینەت بێت: واتە لەگەڵ ئەوەی سزاو ئازارەکەی بە سوێیە، تەنها شێوەیەك نییەو ڕاستەوخۆ بچێژرێت، بەڵکو بە گرفت و مەینەتە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ﴾الدخان/٤٣-٤٦ واتە: درەختی ژەقنەبوت خواردنی تاوانبارانە، وەك كانزای تواوە لە سكیاندا قوڵپ دەدات، وەك قوڵپی ئاوی كوڵ هاتو. هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا﴾المزمل/١٢-١٣ واتە: كۆت و زنجیرو پێوەندی قورس و ئاگری داخراومان لایەو خواردنی بەگرفتمان لایە، كە لە قورگ دەگیرێت وسزای بە ئێش وئازارمان لەلایە.

٣) هەمو خواست و ویستێك زەوت بكات: لەگەڵ ئەوەدا كە دۆزەخیی ئازار دەچێژێت، بواری پەلەقاژێ و خۆ ڕاپسكانی نامێنێت، بگرە پارێز لە كام شوێنی دەكات، بەو شوێنە ئازار دەدرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ﴾الحاقة/٣٠-٣٢ واتە: بیگرن و كۆت و بەندی بكەن، پاشان بیخەنە دۆزەخەوە، ئنجا بیخەنە زنجیرێكەوە كە درێژییەكەی حەفتا گەز بێت . هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ﴾غافر/٧١-٧٢ واتە: ئایا كەسێك هیچ شك نەبات خۆی لە سزای توندو بە ئازاری ڕۆژی دوایی پێ بپارێزێت، بێجگە لە دەم و چاوی وەك ئەو كەسە وایە، هیچ ناخۆشییەكی توش نەیەت ؟ بە ستەمكاران دەوترێت: بچێژە سزای ئەو كردەوە خراپانەی ئەنجامت دەدان.

یـــاخود دەفـــەرموێت: ﴿خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ﴾لدخان/٤٧-٥٠ واتە: بیگرن و ڕاپێچی بکەن بۆ ناوەڕاستی دۆزەخ، پاشان لە ئاوی کوڵاوی بەسەردا بڕێژن، پێیان دەڵێن: بچێژە: تۆ بە شکۆو نازدار بویت، ئا ئەمە بو کە تێیدا بە گومان بون .

ب- ژانی ڕاستەقینەی تێدایە: مەبەست لەو ژانە دو خاڵە:

١) ئەوپەڕی ژانە: واتە هێندە بە سوێ و توندە کار لە دڵ و دەرون دەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ﴾الهمزة/٥-٩ واتە: تۆ چوزانیت تێك شکێنەر چییە ؟ ئاگری داگیرساوی بڵێسەداری خوایە، کە ژانی گەرمی و ئێشەکەی دەگات بە قوڵایی دڵ، ئەو بێ ئیمانانەی تێدا دەجەڕێنرێت و قەتیس دەکرێت و دەرگایان لەسەر کڵۆم و داخراوەو بەستراوەتەوە بە کۆڵەکەی ڕایەڵ کراو بەسەریاندا . پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (نارُكُمْ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءً مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ قيلَ: يَارَسُولَ اللهِ إن كَانَت لَكَافِيةٌ ؟ قَالَ: فُضِّلَت عَلَيهِنَّ بِتسعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءً، كُلُّهُنَّ مِثلُ حَرِّهَا) متفق عليه[١] واتە: ئەم ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئەگەر هەر ئەمەش بێت بەسە بۆ ئەوەی سزای توندی هەبێت، فەرموی: لەمە زیاترە بە شەست ونۆ بەش هەریەکەیان وەك ئەم ئاگرە گەرمە.

---

١ ـ بوخاری (٣٠٩٢)، موسلیم (٢٨٤٣) .

٢) هەمو جۆری ژانە: دۆزەخ هێندە فراوانە هەرچەندی تێ فڕێ بدرێت لوشی دەدات و تێکی دەشکێنێت و بە ڕق و قینەوە دەیپێچێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾سورەتی ق/٣٠ واتە: لە ڕۆژێكدا بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بویت ؟ ئەویش دەڵێت: ئایا زیاتر هەیە؟ پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (لا تزَالُ جهَنَّمُ تقولُ: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ ؟ حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ، فتقُولُ: قَطْ، قَطْ وَعِزَّتِكَ، وَيَزْوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ)متفق عليه[١] واتە: بەردەوام دۆزەخ دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ هەتا پەروەردگاری شکۆمەند پێ دەخاتە سەری، ئەویش دەڵێ: هەرگیزاو هەرگیز، سوێند بە شکۆمەندیت، وا بەسەر یەكتریدا تێكترینجاون، كەڵەكەبون . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ١٢ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ١٣ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا﴾الفرقان/١٢-١٤ واتە: ئەگەر دۆزەخ بێ ئیمانان لە شوێنێكی دورەوە ببینێت گوێیان لە نەڕەو نرکەو فیشكەی دەبێت و ئەگەر فڕێ بدرێنە شوێنێكی تەنگەبەریەوەو دەستیان لە گەردنیان توند كرابێت، ئەو كاتە لەوێدا هاواری تیاچون دەكەن، پێیان دەوترێت: ئەمڕۆ داوای یەك جۆری تیاچون مەكەن، بەڵكو داوای هەمو جۆرە تیاچونێك بكەن .

ئنجا سەرەڕای ئەوەی دۆزەخ هێندە فراوانە، بە داخیشە لە بێ ئیمانان، جۆرەها سزای تێدایە، سەبارەت بە لاشەی دۆزەخییەكانیش هەر بە هەمان شێوە سازو لەبارە بۆ جۆرەها سزا، چونكە لاشەیان وەك دنیا نییە، واتە لاوازو ناسك و بێ هێز.. خاوەنی هەستەوەری سنوردار.. چەشنی

١ بوخاری (٤٨٥٠) ، موسلیم (٢٨٤٨)

دیاری کراو، بەڵکو بە پێچەوانەوە کەتەو زل و ناشرین و بەرگەی هەمو سزایەك دەگرن و تیاچونیان نییە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَا بَينَ مَنكِبَي الكَافِرِ مَسِيرَةُ ثَلاثَةُ أيَّامٍ لِراكِبٍ مُسْرِعٍ)رواه البخاري مسلم[1] واتە: نێوانی هەردو شانی بێ ئیمان بە ئەندازەی سێ ڕۆژە ڕێیە بە سواری وڵاخێك بە خێرایی بڕوات .

هەروەها دەفەرموێت: (ضَرسُ الكافِرِ مِثلُ أُحُدٍ وَغِلظُ جِلدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاثٍ)رواه مسلم والترمذي[2] واتە: ددانی پێشەوەی بێ ئیمان، واتە کەڵبەی وەك کێوی ئوحود وایەو ئەستوراییی پێستەکەشی سێ ڕۆژە ڕێیە. هەروەها دەفەرموێت: (إنَّ أهْلَ النَّارِ يَبكُونَ حَتَّى لَو أُجْرِيَتْ السُّفُنُ فِي دُمُوعِهِم لَجَرَت، وَإنَّهُمْ لَيَبكُونَ الدَّمَ )[3] واتە: دۆزەخییەکان ئەوەندە دەگرین، ئەگەر کەشتی لە فرمێسکیاندا بکەوێتە ڕێ ئەوا دەتوانێت بڕوات، گریانەکانیش لە جیاتی فرمێسك خوێنە.

---

١ـ بوخاری (٦٥٥٣)، موسلیم (٢٨٥٢).

٢ـ موسلیم (٢٨٥١).

٣ـ نوسەری بەڕێز نوسیویێتی (رواه الحاكم وقال صحيح وافقه الذهبي) بۆ زانیاری زیاتر بزانە کە ڕاستە(حاکم ٤/٦٠٥)ڕیوایەتی کردوەو ئیمامی زەهەبیش لایەنگری بوە (حوکمی فەرمودەوانانە، کە مەرجی وەرگرتنی فەرمودەی لای حاکم ئەوەیە، کە ئیمامی زەهەبی لایەنگرێتی بکات، تا بە سەحیح بناسرێت)، شێخی ئەلبانی ڕەحمەتیش لە (سلسلة الأحاديث الصحيحه ٤/٢٤٥ ، ژ ١٦٧٩) دا ئەم فەرمودەیەی بە حەسەن ناساندوە.

# پاشکۆی یەکەم

# گرنگی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی

ئیمانهێنان بە ڕۆژی دوایی گرنگییەکی حەتمی هەیەو لە دوای ئیمان بە خواوە دێت، چونکە ئیمان هێنان بە خوای گەورە، تەفسیری چۆنیەتی بەدیهێنانی ئەم بونەوەرە دەکات و سەرەتای دروست کرانی ئەم ژیانە ڕون دەکاتەوە، بەڵام ئیمان بە ڕۆژی دوایی سەرئەنجامی ئەم دروستکراوانە دیاری دەکات و تەفسیری مەبەست و ئامانج لە بونی ژیان دەکات، قورئانی پیرۆزیش گرنگی زۆری پێداوە وەك لەم خاڵانەدا بەدیار دەکەوێت:

١) دەیبەستێتەوە بە ئیمان بە خوای گەورەوە: وەك دەفەرموێت: ﴿..وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ..﴾البقرة/١٧٧ واتە: بەڵکو چاکە ئەوەیە، ئەو کەسە ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بهێنێت..

٢) لە زۆر جێگەدا باسی دەکات و دەیکاتە دەستپێك و پاش وتەی سورەتەکان وەك دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ﴾الحج/١ واتە: ئەی خەڵکینە پارێز لە خوا بکەن، بە ڕاستی ڕاچەنین و لەرزەی ڕۆژی دوایی شتێکی مەزنە . یان دەفەرموێت: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ۝١ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾الواقعة/١-٢ واتە: ئەگەر ڕوداوەکە قەوما، ڕودانیشی هیچ درۆی تێدا نییە .

هەروەها دەفەرموێت: ﴿..وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾کۆتایی سورەتی (النبأ) واتە: بێ ئیمان لە ڕۆژی دواییدا دەڵێت خۆزگە من خۆڵ بومایە .

یاخود دەفەرمویت: ﴿..فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي﴾كۆتایی سورەتی الفجر.
واتە: ئەی نەفسی دڵنیا بچۆرە ریزی بەندە نزیكەكانمەوەو بچۆرە بەهەشتەكەمەوە...

٣) بە چەندەها شێوە ناوی ساتە وەختی ڕودانی و بەهەشت و دۆزەخ هاتوەو هەریەك لەو ناوانەش واتایەكی گرنگی و مەزنی ئەو بارو دۆخە دەگەیەنن، بۆ نمونە:

ا- دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەم ناوانە هاتوە: (يَومُ الْبَعْثِ، يومُ القِيامَةِ، يَومُ الحِسَابِ، يَومُ التلاقِ، يَومُ الجمعِ، يومُ التغَابُنِ، يومُ التنَادِ، يومُ الحَسْرَةِ، الآزِفةِ، الغَاشِيَةِ، الواقِعَةِ ...

ب- دەربارەی پلەكانی بەهەشت ئەم ناوانە هاتوە: (دارُ السَلامِ، دارُ الخُلدِ، دارُ المُقَامَةِ، جَنَّةُ المَأوى، جنَّاتُ عَدنٍ، جنَّاتُ النَعِيمِ، والفِردَوس...

ج- دەربارەی سەختی دۆزەخ ئەم ناوانە هاتوە: (النَار، جهَنَم، سَقَر، الجَحِيم، السَعِير، لظى، الحُطمَة، الهَاوِيَة...

# پاشکۆی دووەم

## کاریگەریی ئیمانهێنان بەڕۆژی دوایی لەسەر ژیانی موسوڵمان

یەکەم: سەر ئەنجام و چارەنوسی بۆ دیاری دەکات، ئەمیش مشوری خۆی دەخوات و کار بۆ قیامەتی خۆی دەکات.

دووەم: بە تێڕوانینێکی واقیعیانە ژیانی دنیا دەنرخێنێت و لە سنوری پێویست زیاتر گرنگی پێ نادات و کۆڵی پێوە هەڵناگرێت و هەمو وزەو تواناکانی تێدا خەرج ناکات و سەرجەم خواست و ئاواتەکانی پێوە نابەستێتەوە.

سێ یەم: هەوڵی کردەوەی چاك دەدات و کاتی خۆی لە شتی بێ کەڵکدا بەفیڕۆ نادات، چونکە دەزانێت ڕۆژێك چاوەڕوانیەتی، کە تەنها توێشوی کردەوەکانی بە کەڵکن و لەو ڕۆژەدا هەر ئەوانەی جێ دەگرن.

چوارەم: خۆی لە کردەوەی ناپەسەندو ڕەفتاری بەدو خراپ بە دور دەگرێت و پەرێزیان لێ دەکات، چونکە دەزانێت لەو ڕۆژەدا گیرۆدەیان دەبێت.

# پایەی شەشەم

# ئیمان هێنان بە قەزاو قەدەر

**بەندی یەکەم: پێنج ڕێسای ڕیشەیی**

- باسی یەکەم: خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەمو شتێك هەبومو هەیە .
- باسی دوەم: سەرجەمی زانیاریەکان لە ( لوح المحفوظ )دا تۆمار کراون .
- باسی سێیەم: هەرچی ڕو دەدات بە ویست و زانیاری خوای گەورەیە .
- باسی چوارەم: هەرچی لە بونەوەردایە دروستکراوی خوای گەورەیە .
- باسی پێنجەم: هەرچی ڕودەدات چاکەو خێر ودادی خوای گەورەیە .

**بەندی دوەم: چوار تابلۆی ڕێڕەوی ئاڕاستەوانی**

- باسی یەکەم: مرۆڤ پشکی لە ئەنجامدانی کارەکانیدا هەیە .
- باسی دوەم: ڕێنمایی خوایی بۆ سەرجەم بەندەکانە .
- باسی سێیەم: بیانوهێنانەوە بە قەزاو قەدەر مایە پوچییە .
- باسی چوارەم: دەستەبەرکردنی هۆکار پێچەوانەی قەزاو قەدەر نیە .

**پاشکۆ: کاریگەری ئیمان هێنان بە قەزاوقەدەر .**

## پایەی شەشەم: ئیمانهێنان بەقەزاو قەدەر

قەزاو قەدەر: ئەندازەگیری ومەزندەو بڕیاری خوای گەورە سەبارەت بە دروستکراوەکانی بەپێی زانیاری پێشینەو بەگوێرەی کاربەجێی و دانایی خوی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ﴾القمر/٤٩ واتە: ئێمە هەمو شتێکمان بە ئەندازەیەك دروست کردوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ﴾الرعد/٨ واتە: هەمو شتێك لای خوا بە ئەندازەو بڕی دیاریکراوە.

## بەندی یەکەم: پێنج ڕێسای ریشەیی

باوەڕهێنان بەقەزاو قەدەر ئەم خاڵانەی خوارەوەدەگرێتەوە:

ڕێسای یەکەم: ئیمانهێنان بەوەی، کە خوای گەورە زانیاری دەربارەی هەمو شتێك هەبوەو هەیە، بە ورد و درشتییەوەو لە ئەزەلەوەو هەتا هەتایە، پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی خۆیەوە، یان پەیوەست بێت بە فەرمانی بەندەکانیەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾المجادلة/٧ واتە: ئایا نابینی کە خوای گەورە دەزانێت چی لە ئاسمانەکان وچی لە زەوی دایە؟ هەر سێ کەسێك چی بکەن، خوا چوارەمیانە، ئەگەر پێنج کەس بن خوا شەشەمیانە، لەوەکەمتر ولەوە زیاتر بن لە هەرکوێ بن خوا لەگەڵیانە، پاشان لە ڕۆژی دواییدا هەواڵی ئەوکردەوانەیان پێ دەداتەوە، کە کردویانن، بەڕاستی خوا بە هەمو شتێك

زانایە.. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾الانعام/٥٩ واتە: هەرچی لە وشکانی و دەریادا بێت خوا دەیزانێت، هەرگەڵایەکیش بوەرێت حەتمەن دەیزانێت .

کەواتە دەبێ بزانین، کە ئەم بونەوەرو ژیانە بە پێی زانیاریەکی وردی پێشینەو کاربەجێی مەحکەمی خوای گەورە دەڕوات بەڕێوەو، ڕێسایەکی پتەوی بۆ دیاری کردون، هیچ شتێك بێ سەرو بەر بەڕێوە ناچێت.

ڕێسای دوەم: باوەڕهێنان بەوەی خوای گەورە سەرجەم زانیاریەکانی دەربارەی ژیان وبونەوەر لە (لوح المحفوظ) دا تۆمار کردوە، وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ الحج/٧٠ ئایا نازانی کە خوا دەزانێت چی لە ئاسمان و زەوی دایە ؟ هەمو ئەو زانیاریانەش لە نوسراودایە واتە ( لوح المحفوظ) ئەوە گشتی بەلای خوا وە ئاسانە. پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الخَلَائِقِ قَبْلَ أنْ يُخلَقَ السَّمَاوَاتِ والأرضِ بخَمْسِينَ ألفَ سَنَةٍ)رواه مسلم[١] واتە: خوای گەورە ئەندازە گیری دروست کراوەکانی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان وزەوی بە پەنجا هەزار ساڵ دروست بکات.

ڕێسای سێ یەم: ئیمانهێنان بەوەی هەر شتێك لە بونەوەردا ڕو بدات بە ویستی خوای گەورە ڕو دەدات، پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی خواوە، یان پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی دروست کراوەکانییەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ال عمران/٤٠ واتە: بەوچەشنە هەرچی خوا بیەوێت دەیکات. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ

١ ـ موسلیم (٢٦٥٣).

تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ وَتَرۡزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴾ال عمران/۲٦-۲۷ واتە: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم بڵێ: خوایە گیان خاوەنی موڵك و دارای، دارایی دەدەیت بە هەر کەسێك خۆت بتەوێت ودارایی لە هەرکەس دەسەنیتەوە، کە خۆت بتەوێت، ئەو کەسە شکۆمەند دەکەیت، کە خۆت دەتەوێت، هەرکەسیش کەخۆت بتەوێت سەرشۆڕی دەکەیت، خێروچاکە بە دەست تۆیە، توانات بەسەر هەمو شتێکدا هەیە، شەو بەناو ڕۆژدا دەبەیت وڕۆژ بەناوشەودا دەبەیت، زیندو لە مردو دەردێنیت، مردوش لە زیندو دەخەیتەوە، هەرکەسێك خۆت بتەوێت بە بێ هەژمار ڕۆزیی دەدەیت .

ڕێسای چوارەم: ئیمانهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردایە بە خۆی و سیفەت وجوڵەیەوە دروست کراوی خوای گەورەیە، وەك دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾الزمر/٦٢ خوا دروستکاری هەمو شتێکەو خۆی بەسەر هەمو شتێکدا چاودێرو سەروکارە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا﴾الفرقان/۲ واتە: خوا هەموشتێکی دروستکردوەو بە مەزەندە مەزندەی کردوە.. دەربارەی ئیبراهیم علیەالسلام، کە بە گەلەکەی دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ الصافات/٩٦ واتە:خوا ئێوەی دروست کردوە، هەروا ئەو کردەوەیەش، کە ئەنجامی دەدەن.

ڕێسای پێنجەم: ئیمانهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردا ڕو دەدات سەبارەت بە خوای گەورە، چاکەو خێرەو بە پێی کاربەجێیی و دادگەریی خۆی ئەنجامی دەدات، چونکە خوای گەورە هیچ شتێك دروست ناکات و

هیچ فەرمانێك نادات خێری تێدا نەبێت، گەرچی سەبارەت بە دروستکراوەکانی ئەوەی بە خێر بۆیان تەواو بێت خێرەو ئەوەی بە شەڕ رویان تێ بکات شەڕە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾البقرة/٢١٦. واتە: ڕەنگە شتێکتان پێ ناخۆش بێت و ئەوە خێری تێدا بێت بۆتان، ڕەنگە شتێکیشتان پێ خۆش بێت، کەچی شەڕی تێدا بێت بۆتان، خوا دەزانێت و ئێوە نایزانن. پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (عَجَبًا لِأمرِ المُؤمِنِ إنَّ أمرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ وَلَيسَ ذَاكَ لِأحَدٍ إلَّا لِلمُؤمِنِ إن أصَابَتهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيرًا لَهُ وَإن أصَابَتهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيرًا لَهُ) رواه مسلم واحمد[1]واتە: کاری موسوڵمان سەیرە: هەمو کارێکی بە چاکە بۆ دێتەوە، ئەوەش بۆ هیچ کەس نییە بۆ موسوڵمان نەبێت، چونکە کە توشی خۆشییەك دەبێت سوپاسگوزاری خوا دەکات ئەمەش چاکەیەو بۆی دەنوسرێت، ئەگەر توشی ناخۆشییەك بو ئارام دەگرێت، ئەمەش چاکەیەو بۆی دەنوسرێت.

ئیبنوددەیلەمی بۆمان دەگێڕێتەوە، کە چۆتە لای ئوبەی کوڕی کەعب خوای لێ ڕازی بێت پێی گوتوە: ئەگەر خوای گەورە خەڵکی ئاسمانەکان و زەوییەکەی سزا بدات، سزایان دەدات وستەمیان لێ ناکات، ئەگەر ڕەحمیان پێ بکات ئەوا ڕەحمەتەکەی لە کردەوەکانیان چاکترە بۆیان، ئەگەر بە قەد چیای ئوحود ئاڵتون لە پێناوی خوادا ببەخشیتەوە، خوا لێت وەرناگرێت، هەتا باوەڕ بەقەدەر نەهێنیت و نەزانیت، کە ئەوەی توشت دەکات بۆ

---

١ ـ موسلیم (٥٣١٨)، ریوایەتەکەی ئیمامی ئەحمەد کە شێخی ئەلبانی لە (سلسلة الاحاديث الصحيحة ١/٢٧٦ ـ ١٤٧) بە سەحیحی داناوە دەفەرموێ: (عَجِبْتُ لأمرِ المؤمنِ " إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ ، إنْ أصَابَهُ مَا يُحِبُّ " حَمَدَ اللهَ وكَانَ لَهُ خَيرٌ ، وإنْ أصَابَهُ مَا يَكْرَهُ فَصَبَرَ " كَانَ لَه خَيرٌ ، وَلَيسَ كُلُّ أحَدٍ أمْرُهُ كُلُّه خَيرٌ إلا المؤمنِ) .

ئەوە نییە بە هەڵەتدا بەرێت، وەئەگەر لەسەر غەیری ئەم باوەڕە بمریت دەچیتە ناو ئاگرەوە..

ئیبنوددەیلەمی دەڵێ: چومە لای ئیبنو مەسعودیش هەمان فەرمایشتی پێ وتم، پاشان چومە لای حوزەیفە خوا لێی رازی بێت، ئەویش هەمان شتی پێ وتم، پاشان چومە لای زەیدی کوری سابت، ئەویش هەر هەمان فەرمایشتی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بۆگێڕامەوە[١] .

## بەندی دووەم: چوار تابلۆی رێڕەوی ئاراستەوانی

ئنجا بەپێودانگی ئەوخاڵانەی سەرەوە پێویستەلەم مەسەلانە دڵنیا بین:

### باسی یەکەم: مرۆڤ پشکی لە ئەنجام دانی کردەوەکانیدا هەیە.

خوای گەورە مرۆڤی بە خۆی وسیفەت و کردەوەکانییەوە دروست کردوە، ئنجا تواناو ویستی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا پێداوەو دەتوانێت لە سنوری دەسەلاتیدا، ئەوەی دەیەوێت ئەنجامی بدات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا﴾النبأ/٣٩ واتە: هەر کەس بیەوێت رێگەی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری دەگرێتە بەر .

---

١ نوسەری بەڕێز نوسیوێتی: ( رواه ابوداود وابن ماجه ، واحمد والطبراني ، وابن حبان ، وهو في صحيح الجامع الصغير)، بەلام بۆ زانیاری زیاتر ئەمە فەرمودەکەیە: (عَنِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ ، قَالَ: لَقِيتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُ وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنْ هَذَا الْقَدَرِ ، فَحَدِّثْنِي بِشَيْءٍ لَعَلَّهُ يَذْهَبُ مِنْ قَلْبِي ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَوْ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَوَاتِه.. فَذَكَرَهُ إِلَى قَوْلِه: حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ ، زَادَ: وَتَعْلَمُ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ ، وَلَوْ مِتَّ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ لَدَخَلْتَ النَّارِ ، قَالَ: فَلَقِيتُ حُذَيْفَةَ ، فَحَدَّثَنِي بِمِثْلِ ذَلِكَ ، وَلَقِيتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ، فَحَدَّثَنِي بِمِثْلِ ذَلِكَ ، وَلَقِيتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ، فَحَدَّثَنِي عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِثْلِ ذَلِكَ) . ئەمە ریوایەتی ئەبوداود (٤٦٦٩)شێخی ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٢٤٤)دا بە سەحیحی ناساندوە .

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إعمَلوا فكُلٌ مُيَسَّرٌ لِمَا خَلِقَ لَهُ . أمَّا أهْلُ السَّعادَةِ فيُيَسَّرُونَ لِلسَّعَادَةِ، وأمَّا أهلُ الشَّقَاوَةِ فيُيَسَّرُونَ لِلشَّقَاوَةِ ، ثم قال نبي الله صلى الله عليه وسلم: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ﴾ الليل ٥ -١٠، رواه البخاري ومسلم[١] واتە: کار بکەن هەمو کەسێك مەیسەرانە بۆ ئەوە دروست کراوە کە بۆی رەخسێنراوە، بەختەوەران کار ئاسانن بۆ کاری بەختەوەران و، بەدبەختان کار ئاسانن بۆ کاری بەد بەختان. پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە، کە دەفەرموێت: هەر کەسێك ببەخشێت و پارێزی خوا بکات و ئیمان بە رێبازی پاکی ئیسلام بهێنێ، کار ئاسانی دەکەین بۆ رێگەی ئاسان و حەوانەوە، هەرکەسێکیش چروکی بکات وهەوڵی دەوڵەمەندی بدات و رێگەی چاکی ئیسلام بە درۆ بزانێت، رێگەی سەخت ومەینەتی بۆ دەکەینەوە .

ئنجا هیچ کام لە ویست و زانیاری بێ سنوری خوای گەورە لەگەڵ ویستی سنورداری مرۆڤ دا تێك ناگیرێن، چونکە هەرچی مرۆڤ بیەوێت بیکات و ئەنجامی بدات، ویستی خوای لەسەرە، ئەگەر چی پێشی رازی نەبێت، لەبەر ئەوەی هیچ شتێك نییە لە بونەوەری خوادا لە زانیاری خوادا نەبێت و ویستی خوای بەسەردا زاڵ نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾التكوير/٢٨-٢٩ واتە: بۆ هەرکەس لە ئێوە کە بیەوێت رێگەی راست بگرێتە بەر، ناشتانەوێت هەتا خوای پەروەردگاری جیهان نەیەوێت.

---

١ - بوخاری (٧١٢٤) ، موسلیم (٤/٢٠٣٩ ژ. ٢٦٤٧).

## باسی دووەم: ڕێنمایی و پەیامی خوای گەورە بۆ سەرجەم بەندەکانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ﴾النساء/١٦٥ واتە: پێغەمبەرانێکمان ڕەوانە کردوە، کە مژدەدەرو ترسێنەر بون، بۆ ئەوەی خەڵکی لە دوای ڕەوانە کرانی پێغەمبەران بیانویان لەسەر خوا نەبێت. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾الاسراء/١٥ واتە: ئێمە سزا دەری هیچ گەلێك نین، هەتا پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە نەکەین، کەواتە: پەیامی خوای گەورە گشتییە بۆ سەرجەم بەندەکانی بە ئیماندارو بێ ئیمانەوە و هەر کەس شوێنی بکەوێت و بڕوای پێ بهێنێت، بە ویستی خۆیەتی و کەس زۆری لێ ناکات، هەرکەسێکیش پشتی لێ هەڵ بکات و ئیمانی پێ نەهێنێت هەر بە ویستی خۆیەتی و کەس بە تۆپزی ناچاری ناکات و بۆی نییە پاساو بەوە بهێنێتەوە گوایە خوای گەورە لە چارەی نوسیوە بێ ئیمان بێت! چونکە ڕێنمایی خوای گەورە دوجۆرە:

ا) ڕێنمایی نیشان دان (الدلالة والإرشاد): ئەم جۆرەیان هەمو ئەوانە دەگرێتەوە، کە پەیامی خوایان پێ بگات و بانگەوازی ئیسلامی بدرێت بە گوێیاندا، لەسەرئەم جۆرەیان خەڵکی بە گشتی بیانو بڕاو دەبن و پاساویان نامێنێت و بەرپرسیار دەبن لەسەری، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾فاطر/٢٤ واتە: هیچ ئومەتێك نییە، کە ترسێنەرێکی تێدا ڕەوانە نەکرابێت.

ب) ڕێنمای یارمەتی دان(الإعانة): ئەم جۆرەیان تەنها ئەوانە دەگرێتەوە، کە بە لێبڕاوی بەدەم بانگەوازو جۆری یەکەمی ڕێنماییەکەوە دەچن، بەڕاستی دەیانەوێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە، لەم پێناوەشدا کەم

تەرخەمی ناکەن و چاولێکەریی وگومان وخۆبەزلزانی و بەرژەوەندی ڕێگەیان لێ ناگرێت و پەردە نادات بەسەرچاو دڵ وگوێ یان دا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾العنكبوت/٦٩ واتە: ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا کۆشش دەکەن ڕێنماییان بۆ ڕێبازە ڕاستەکانمان دەکەین .

## باسی سێیەم: بیانو هێنانەوە لەسەر بێ ئیمانی بە قەزاو قەدەر پوچ وبێ ناوەڕۆکە.

بێ ئیمانان بۆ پاساوی بێ ئیمانییەکەیان هەمیشە بیانو بە قەدەری خوا دەهێننەوەو دەڵێن: ئەگەر خوا لە چارەی نەنوسینایە ئیمانمان دەهێنا، یان ئەگەر خوا بیویستایە ڕێنمایی دەکردین، ئاشکرایە ئەم بیانوە پوچ و بەتاڵە، چونکە:

١) وەك لە خاڵی پێشودا باسمان کرد پەیامی خوا دەگات بە هەمو کەس، لەسەر ئەوەش سزای بێ ئیمانان دەدات کاتێك پەیامەکە بە درۆ دەخەنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَا ﴾الانعام/١٤٨ واتە: ئەوانەی هاوبەشیان بۆخوا داناوە دەڵێن ئەگەرخوابیویستایە نە ئێمەو نە باوباپیرانمان هاوبەشمان دانەدەناو هیچمان حەرام نەدەکرد ! ئەمانیش وەکو ئەوانەی پێش خۆیان ئەو درۆیە دەکەنەوە، تاکو سزای ئێمەیان دەچێژن.

ئنجا ئەگەر بێ ئیمانان بە ویستی خۆیان پێداگری لەسەر بێ ئیمانیەکەیان نەکەن، چۆن خوای گەورەو کاربەجێ لەسەر شتێك سزایان دەدات، کە ویستی خۆیانی تێدا نەبێت؟!

ب) بیانو هێنانەوە بە قەدەر درۆیەو بەدەم خواوە هەڵدەبەسترێت، چونکە قەدەری خوای گەورە پێش ڕودانی نادیارەو کەس نایزانێت، ئیتر بێ باوەڕان چۆن دەزانن، کە خوا لەسەری نوسیون، کە بێ ئیمان بن پێش ئەوەی خوای گەورە پێیان ڕاگەیەنێت! کامیان تەماشای (لوح المحفوظ)ي کردوە؟

بۆ لە فەرمانی ڕاستەوخۆی ئاشکرای خوای گەورە ڕادەکەن بۆ فەرمانی نادیار و پەنهانی خوای گەورە، کە هیچ بەرپرسیار نین لە بەرانبەری؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ﴾ الانعام/١٤٨ واتە: ئەی محمد صلى الله عليه وسلم بڵێ: ئایا هیچ زانیارییەکتان لەم بارەیەوە هەیە بۆمان باس بکەن ؟ تەنها شوێن گومان دەکەون و هیچی تر ئەوەی ئێوە دەیڵێن تەنها درۆیەو بەس.

## باسی چوارەم: دەستەبەرکردنی هۆکارەکان، پێچەوانەی ئیمان بەقەزاو قەدەر نییە.

هەرچەندە ئیمانمان وایە، کە خوای گەورە هەمو شتێکی بەدەستەو بە بێ ویستی خۆی هیچ کارێك ناکاتە ئەنجام، بەڵام لە هەمان کاتدا فەرمانمان پێکراوە، کە ڕەچاوی هۆکارەکان بکەین و بە هەندیان بگرین و فەرامۆشیان نەکەین، چونکە هۆکارە شەرعیەکانیش هەر قەدەری خوای گەورەن وەك دەربارەی(ذو القرنين) دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾الكهف/٨٤-٨٥ واتە: ئێمە دەسەڵاتمان لەسەر زەویدا پێداو لە هەمو شتێك هۆکارێکمان بۆ دەستەبەر کرد، ئەویش شوێن هۆکارەکان کەوت و بەکاری هێنان... پێغەمبەریش صلى الله

عليه وسلم دەفەرموێت: (تدَاوا، فإنَّ اللهَ عزّوَجَلّ لَمْ يَضَعْ دَاءً الّا وَضَعَ لَهُ دَوَاءً، غَيْرَ دَاءٍ واحِدٍ: الْهَرِمُ )[١] واتە: دەرمان بەکار بهێنن، چونکە خوای گەورە هیچ دەردێکی دانەناوە دەرمانی بۆ دانەنابێت، بێجگە لە دەردێك: کە پیرییە. کاتێك پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێبێت، چو بۆ شام و چاوی بە فەرماندەی هەرێمەکان کەوت هەواڵیان پێدا پەتایەکی کوشندە بڵاوبوەتەوە، ئەویش ڕاپرسی بە کۆچکەران (مهاجرين) پشتیوانان (الانصار) کرد، پاشان بەوانەی بۆ ڕزگار کردنی وڵاتان کۆچیان کردبو لە ڕیش سپییانی قورەیش، هەمو ئەمانە یەك دەنگ بون لەسەر گەڕانەوە، بۆ ئەوەی لەو پەتایە بەدور بن، پێشەوا عمریش بە گەڕانەوەکەی کرد سەیدنا ئەبو عوبەیدە خوا لێی ڕازی بێت پێی گوت: باشە لە قەدەری خوا رابکەین؟ سەیدنا عومەر گوتی: یەکێکی تر وای بگوتایە ئەی ئەبا عوبەیدە، بەڵێ لە قەدەری خوا ڕادەکەین بۆ قەدەری خوا (رواه البخاري)[٢].. هەروەها پێشەوا عمر خوای لێ ڕازی بێت کۆمەڵێك لە خەڵکی یەمەنی بینی بە بێ تێشو هاتبون بۆ حەج فەرموی: ئێوە کێن ؟ وتیان: ئێمە پشت بەستوانین، گوتی: ئێوە تەممەڵ و تەوەزەلانن، پشت بەستو کەسێکە تۆوەکەی بە زەویدا چاند بێت، ئنجا پشتی بەخوا بەستبێت! کەواتە پێویستە هۆکارەکان ئەنجام بدەین، ئنجا پشت بە خوای گەورە ببەستین و بزانین کە بەرهەم ودەرئەنجامی کارەکان بە دەست خوایەو بە تەنها هۆکارەکان هەمو شتێك نین.

---

١ ـ نوسەری بەڕێز نوسیویێتی: (رواه الاربعة وقال الترمذي: حسن صحيح) بۆ زانیاری زیاتر: ئیمامی ئەحمەد لە مەسنەدەکەی خۆیدا (٢٧٨/٤) دا هێناویێتیەوەو شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٦٥/١) دا گوتویەتی سەحیحە .

٢ ـ بوخاری (٥٧٢٩)، موسلیم (٢٢١٩) .

# پاشكۆ

## كاریگەریی ئیمانهێنان بە قەزاو قەدەر

یەكەم: پشت بەستن بە خوای گەورە نەك بە هۆكارەكان، چونكە هۆكارەكان و دەرئەنجامەكان قەدەری خوان و هەمو شتێك بەقەدەری خوا دەگاتە ئەنجام.

دووەم: سوپاس كردنی خوای گەورە لە كاتی بەدەست هێنانی خواست و ئامانجەكاندا وخۆ بەدور گرتن لە بەخۆنازین ولەخۆبایی بون، چونكە بەدەست هێنانیان بەهرەی خوایەو هەر خۆی هۆكاری چاكی بۆ دەستەبەر كردوە . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴾الكهف/٢٣-٢٤ واتە: بە هیچ شتیك مەڵێ: من سبەینێ ئەوە دەكەم هەتا نەڵێیت: ان شاء اللە، ناوی خواش ببەو بڵێ: ان شاء اللە، ئەگەر بیریشت چو هەروا بڵێ: بەڵكو خوای گەورە ڕێنماییم بكات بۆ كارێكی لەوە چاكتر..

سێ یەم: ئارامی و دڵنیا بون لەوكاتەدا، كەقەدەری خوای گەورە بەڕێ دەبێت، هەروەها دلگران نەبون و بێ هیوا نەبون بەلەدەست دانی خۆشەویستێك، یاخود دوچار بون بەشتێكی ناخۆشەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن

﴿قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ﴾الحديد/٢٢-٢٣ واتە: هەر ناخۆشی ومەینەتیەك لە زەویدا یان لە نەفسی خۆتاندا توشتان دێت، ئەوە لە نوسراوێكدایە كە (لوح المحفوظ)ە پێش ئەوەی بەدی بێت، ئەوەش بە لای خواوە ئاسانە، بۆ ئەوەی لەوەی لە دەستتان چوە دڵگران وبێ هیوا نەبن ودڵخۆش وبایی نەبن بەوەی پێی داون، خوا هیچ خۆ بەزلزانێكی لەخۆ بایی خۆش ناوێت..

وصلى الله على النبي الكريم

وعلى اله وصحبه وسلم

# سەرچاوەکان


١- قورئانى پيرۆز

٢- مختصر تفسير إبن كثير — محمد على صابونى

٣- في ظلال القرآن — سيد قطب

٤- رياض الصا لحين — شرف الدين يحى النوى

٥- اللؤلؤ والمرجان فيما إتفق عليه‌الشيخان — محمد فؤاد عبدالباقى

٦- مهذب شرح العقيدة الطحاوية — صالح بن عبدالرحمن

٧- الإيمان(اركانه، حقيقته،نواقضه) — محمد نعيم ياسين

٨- شرح ثلاثة الأصول — محمد بن صالح العثيمين

٩- فتح المجيد شرح كتاب التوحيد — عبدالرحمن بن حسن ال شيخ

١٠- معالم التوحيد — مروان ابراهيم القىسى

١١- العقيدة الإسلامية — محمد بن جميل زينو

١٢- حقيقة التوحيد — يوسف القرضاوى

١٣- كتاب التوحيد — صالح بن فوزان الفوزان

١٤- لاإله إلاالله (معناها- مكانتها- فضلها) — صالح بن فوزان الفوزان

١٥- العقائد الإسلامية — سيد سابق

١٦- منهج التربية الإسلامية — محمد قطب

١٧- عالم الملائكة الأبرار — عمر سليمان الأشقر

١٨- الإيمان والحياة — يوسف القرضاوى

١٩- أشراط الساعة — يوسف بن عبدالله الوابل

٢٠- المصطلحات الأربعة في القرآن — أبو الأعلى المودودي

٢١- معجزات قرآنية — سعيد نورسى

٢٢- مع الطب في القرآن الكريم — عبدالحميد دياب واحمد قرقوز

٢٣- رسالة انه الحق — عبدالمجيد الزندانى

٢٤- الإخلاص — حسين العوايشة

# ناوەڕۆك